مەسعوود محەمەد

# چارەسەر کردنی گیروگرفتەکانی

# ڕێنووس و ئەلفوبێی کوردی

گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق
دەستەی کورد، بەرگی نۆهەم، ساڵی 1982

مەسعوود محەمەد

چارەسەر کردنی گیروگرفتەکانی ڕێنووس و ئەلفوبێی کوردی[1]

وەشانی یەکەم: گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق – دەستەی کورد، بەرگی نۆهەم، ساڵی 1982

وەشانی دووم: سایتی www.mamosta.net - ساڵی 2009

---

[1] - ئەم گوتارەی مامۆستا مەسعوود بە ڕێنووسی قەراردادەی کۆڕی زانیاری کورد لە گۆڤارەکەدا نووسراوە، لە ڕێنووسی کۆڕدا واوی درێژ هەروەها یی درێژ بە یەک پیت نووسراون و خەتێکی کورت لەسەر پیتەکەیە، بەڵام لەم نموونەیەدا ڕەچاوی نووسینی باو کراوە.

دەشیا بێ ئەوەی بلکێم بە نەخشەی ناو بانگەوازەکەی دەستەی کوردی کۆڕی زانیاری عێراق لە خۆمەوە نەخشەیەکی لێکۆڵینەوە لە گیروگرفتی ڕێنووسی کوردی بگرمە بەر و لەسەری بڕۆم، بەڵام وا دەزانم نەخشەی ئەو بانگەوازە، کەم و زۆر، وێنەیەکی خۆی لە هەست و نەستی خوێنەری کورددا ڕەنگڕێژ کردوە و لە خۆی ڕاهێناون. لەبەر ئەمە وام بە چاک زانی منیش لەو کەلەبەرانەی کە بانگەوازەکە بەرەو کێشەی ڕێنووس تیشکی پرسیارەکانی بەرێ کردوە سەرەتاتکەی وەرام دانەوە بکەم هەرچەند، وەک وردە وردە دەردەکەوێ، بەشی هەرە زۆری پرسیارەکان کەم و کەسری و، ناوناوە هەڵەشیان تێدایە. بەهەمەحاڵ پیرۆزبایی لە دەستەی کوردی کۆڕی زانیاری عێراق دەکەم لە پێکهێنانی کۆبونەوەی ڕۆشنبیرانی کورد بۆ گەیشتن بەو ئامانجە گرنگ و گەشەی یەکخستنی ڕێنووسمان کە وا تا ئێستا، بە داخەوە، دەسگیری خوێندن و نووسینی کوردی نەبوە.

ئەوەی ڕاستی بێ کاتی خۆی کۆڕی زانیاری کوردیش لە پەراوێزێکی تەسکتردا ئەم ڕێبازی پرس کردن بە لێزانانی گرتە بەر کە هات و پێش هەموو شتێک لیژنەی تایبەتی ڕێکخست بۆ دانانی ئەلفوبێ و ڕێنووس بە ئەندامەتی چەندین لێزانی ئەو کارە لە دەرەوەی جغزی کۆڕ کە ئەوسا دەرفەتی لەوە فرەوانتری نەبوو بۆ ئەنجام دانی کارەکە بە پێی حاڵوبارێک کە لە یەکەم ڕۆژی پەیدا بوونیەوە خۆی تیدا دیتەوە. بەش بە حاڵی خۆم کە هەمیشە چاوەچاوەی هەلی یەکخستنی ئەلفوبێ و ڕێنووسی کوردی بۆتم تەنها داخوازیم لە سەرۆکی نوێی کۆڕی زانیاری عێراق دۆستی بە ڕێز و دێرین دکتۆر «صالح أحمد العلي» ئەوە بوو کە تێکۆشێت بۆ یەکخستنی ئەلفوبێ و ڕێنووسی کوردی چونکە ڕێنووس دەفری نووسین و خوێندن و ڕۆشنبیرییە و هەر تەقەڵێکی هەڵوەشیتەوە کەلێن دەدا بۆ فرەوان بوونی مەودای لەگەڵ یەکدیدا نەگونجانی نووسەران. میللەتێک هێندەی کورد پێویستی بە یەکیەتی هەبێت ناشی خوێندەوارەکانی لە هەوەڵ هەنگاوی خامەگێڕییانەوە، کە ڕێنووسە، لە یەکدی بترازێن. ئێمە کە لەسەر چۆنیەتی نووسینی

«کەرەباب»ی بەری سۆران و «ئەفەنگی» بەری بابان پێک نەیەین چۆن لە ئاست شتە ژیوەریە گرنگەکان تێک دەگەین.

لەم نووسینەمدا وا دەبێ زاراوەی زمانی بێگانە لە بری هی کوردی بەکاردەهێنم بە نیازی تێگەیاندنی ئەوانەی ڕاهاتووی نووسینی تازە بابەتی کوردی نین، ناوناوەش جێگۆڕکێ بە ڕیزی هێندێ خاڵەکانی ناو نەخشەی بانگەوازەکە دەکەم ئەویش بە پێی داخوازیی لەیەک چونی باسەکان. چەند خاڵێکی جودا لە هی بانگەوازەکەش باس دەکەم بە نیازی چارەسەرکردنی گرفتەکانیان، وەک دەریش دەکەوێ گەلێک لە تێکرای ئەو خاڵانە پێویستییان بە لێکۆڵینەوەی ڕێزمانی و فۆنەتیکی و فیلۆلۆژی و بەراوردی هەیە بۆ ئەوەی بگەین بە قەناعەت لەو پێشنیازانەی بۆیان بەدی دەکرێ. بە ڕاستی ترسی درێژەکێشانی وەڕسکەر لە گەلێک شوێندا وازی پێ لە شریتە کێشانی نووسینەکەم هێناوە.

بۆ خاتری ئەوەی خوێنەر لە دەرەوەی ئەم کۆڕە بزانێ نووسینەکەم بە دیار چ جۆرە بابەتێکەوە خەریکی لێکۆڵینەوە بوە لێرەدا نەخشەی خاڵەکانی ناو بانگەوازەکە دەنووسمەوە دواتریش پێبەپێ وەرامی پرسیارەکانیان دەدەمەوە. ئەمەیە نەخشەی ئەو خاڵانە وەک کە لە بانگەوازەکەدا نووسراوە:

1- گیروگرفتی نووسینی دەنگەکان
أ- ئەوانەی نیشانەدارن «بزوێن و نەبزوێن».
ب- ئەوانەی پیتیان بۆ دانەندراوە.
ج- پلەی دەنگە بزوێنەکان.
د- دیفتۆنگەکان «وێ، نگ».

2-گیروگرفتی وشەی سادە و داڕێژراو
أ- ناوی عەرەبی.

ب- پێشگر – پاشگری «پێناسین و کۆ».

3- وشەی نسادە

أ- دیاردەی داتاشین و قووتدانی هەندێ دەنگ.

ب- گیروگرفتی نووسینی ژمارەکان لە «11» وە تا «19».

4- گیروگرفتی نووسینی کردار لەگەڵ ڕاناو لە ڕووی پێکەوە نووسان و پێکەوە نەنووسانەوە.

5- گیروگرفتی نووسینی ئامرازە لێکدەرەکان «حروف العطف».

6- گیروگرفتی چۆنیەتی نووسینی وشە لێکدراوەکان لە بارەی پێکەوە نووساندن و نەنووساندنەوە.

7- گیروگرفتی دانانی نیشانەکان.

## بەشی 1: گیروگرفتی نووسینی دەنگەکان

دیارە مەبەست لە شکڵی ئەو پیتانەیە کە بۆ دەنگەکان قەراردادە بکرێ، دەنا دەنگ وەکوو دەنگ نووسین هەڵناگرێ. بە پێی نەخشەکەش وا پێ دەچێ ئەو پیتانەی بەر یەکێک لەو چوار خاڵانەی کە گیروگرفتی دەنگی بەسەردا دابەش کراوە، نەکەوێ، گیروگرفتی تێدا نەبێ وەک پیتی «ا، س، ش، ف، ن...». جا کە ئەمە وەها بێ دیارە پیتی «هەمزە» و «ە» کە کەوتنە حاڵەتی بە تەنها نووسرانەوە دەبێ «ئ ە» بنووسرێت وەک «نەئ مەھ ئەڵڵاھـ..» لەمەشدا من هیچ گرفت نابینم کاتی خۆشی بڕیاری کۆڕ هەروەها بوو.

1- گیروگرفتی ئەوانەی نیشانەدارن

- «ڵ» پیتی لامی قەڵەو بێت وەک «دڵ، حەڵاڵ».
- «ێ» پیتی یێی کراوە بێت وەک «لێژ، ڕاوێژ».
- «ۆ» پیتی واوی کراوە بێت وەک «زۆر، بالۆرە».

دەمێنێتەوە واوی تیژی درێژ و یێی تیژی درێژ و ڕێی قەڵەو و ئەو دالە کلۆرەی کە لە سلێمانی لە دالی عادەتی دەشۆرێ واش دەبێ بە جارێ دەسوێ. لە پەنا ئەم دالەدا دەنگی «ت»ش وا دەبێ لە ئاخاوتنی سلێمانیدا کلۆر دەکرێ وەیا دەنگەکەی دەگۆڕێ.

لەبارەی ڕێی قەڵەوەوە

تا ئێستا بۆ ئەم دەنگە سێ جۆر پیت هەبوە، یەکیان  ئەوە بو کە بە دوو «ر» دەنووسرا، دوەمیان ئەوەیە کە نیشانەی «حەوت»ی دەخرێتە ژێرەوە، سێیەمیشیان ئەوە بوو کە کۆڕی زانیاری کورد پێشنیازی کردبوو لەسەرەوەی ڕێیەکە نیشانەی «حەوت» دابندرێ.

لە لایەن نووسینی دوو «ر» لە بری ڕێی قەڵەو، من بەش بە حاڵی خۆم لە هیچ حاڵوباردا ڕەوا نابینم بۆ تاکە دەنگ دوو پیت قەرارداده بکرێ چونکە تاکە یەک هۆ و بەڵگە پشتگیری لێ ناکات. دەنگەکان، جگە لە دیفتۆنگ، قەڵەو بن و لاواز بن تاکە دەنگن لەوەشدا کاف و میم و هێ لە ڕێ و لام جودا ناکرێنەوە. ئێمە دەزانین وشە هەیە لە شێوە ئاخاوتنی کوردستانی خوارووودا وەک «صەد، صەگ» بە سینی قەڵەوی وەک صادی عەرەبی دەست پێدەکەن. لە شێوە ئاخاوتنی بادینیشدا ئەم سینە قەڵەوە زۆر باوە کەچی کەس نەهات بڵێ با ئەویش بە دوو «س» بنووسرێ. لامی قەڵەویش هێندەی دوو لامی لەڕە کەچی بە دوو پیت نانووسرێ ئیتر بۆ دەبێ لە نێوان کۆنستانتەکاندا تەنها دەنگی ڕێی قەڵەو دوو پیتی بۆ دابندرێ. ڕاستییەکەی تەنها لە حاڵەتی گوشینی دەنگدا کە بە تەواوی دەبێتە دوو دەنگی تێکچڕمساو ڕەوایە، بەڵکوو پێویستە دوو دەنگ بنووسرێ وەک «کەللە، گوللە، شەننەومەننە». ئێمە ئەگەر ڕێی قەڵەومان بە دوو پیت نووسی و ویستمان وشەی «کر`ه»ی عەرەبی بهێنینە سەر ڕێنووسی کوردی دەبێ بیکەینە «کەررررە». ئەگەر ئەمەش نەکەین لەبەر ناقولایی نووسینی چوار پیت بە دوا یەکدا دەبێ ببڕای ببڕای هیچ دەنگێکی گوشراوی بێگانە بە گوشراوی نەهێنینە سەر ڕێنووسی کوردی دەنا بێلزوم دەبێتە مامڵەت جودایی. بەلای منەوە نووسینی دوو «ر» لەبری ڕێی قەڵەو ناڕەوایە. دەمێنێتەوە نووسینی دەنگی ڕێی قەڵەو بە پیتی نیشانەدار و جێگەی دانانی نیشانەکە.

کاتی خۆی کۆڕی زانیاری کورد لە چەند ڕوێکەوە پەسەندی سەروی پیتەکەی کرد بۆ دانانی ئەو نیشانەیە.

یەکەم: بڕیار درا سەرلەبەری نیشانەکان بکەونە لایەک نەک هەندێک لە ژێرەوە و هەندێک لە سەرەوە بن. چونکە نیشانەی پیتەکانی «هەمزە، لامی قەڵەو، واو، یێ» لە کۆنەوە لە سەرەوە بوون وا بەباش زاندرا نیشانەی پیتی ڕێی قەڵەو و پیتی دیکەش کە هەبێ هەر لە سەرەوە بێ.

دووەم: پیتی دیکە زۆرن لەوانەی خاڵیان لە سەرەوە یا لە ژێرەوە هەیە و شێوەیان لە یەکدی دەکات بە ئاسانیش خوێندراونەوە وەک «ز، ژ» «ت، ن» «ی، ب، پ» «ج، چ» «ف، ڤ، ق». کەواتە ناشێ ترسی سەر لێشێوان لە نۆژەن یەخەی لێکدانەوەی چارەسەرکردنی گرفتی ڕێنووس بگرێ و بڕیارمان لێ هەڵوەشێنێتەوە.

سێیەم: بە وردبوونەوەی ژیرانە دەردەکەوێ وەها چاکە هەتا بلوێ مەودای ژێرەوەی هەموو دێڕێک بۆ دێڕی خواروەتر بەجێ بهێڵرێ. وەک ئاشکرایشە هەموو کەوانەی پیتی «ر» لە خەتی دێڕەکەی دادەکشێ ئنجا کە نیشانەکەش خرایە ژێریەوە لەوانەیە لە کاتی نووسیندا نیشانەکەی تێکەڵ بە دێڕی خوارەوە بێت. ئەم تێبینییە بەوەدا پتر هێز وەردەگرێ کە دەبینین هیچ کامێک لەو پیتانەی نوختەکانیان لە ژێریانەوەیە لە خەتەکەیان داناکشێن تەنها پیتی «ی» نەبێ کە بکەوێتە کۆتایی وشە وەیا بەتەنێ بنووسرێ ئەوساش لە نووسیندا نوختەی بۆ دانانێن. ئەگەر ڕێ هەبا ئەلفوبێیەکی سەرلەبەر نوێ دابندرێ وا باش بوو هیچ پیتێکی، نە خۆی نە خاڵەکانی لە خەتی خۆی بەرەژێر نەچێت تاکوو لە نووسینی دێڕی دواتردا هەموو مەودای سەرووی خۆی بەر خۆی بکەوێ، بەڵام ئەمە کاری کردەنی نییە.

لەگەڵ ئەم تێبینیانەشدا چ فەرقێک نابینم لە نێوان سەرخستن و ژێرخستنی نیشانەی «ر» ی قەڵەو. لە هەر دوو بڕیاردا ڕازیم. بەڵام کە بڕیار بۆ نیشانەکە درا پێویستە هەمیشە لەگەڵیدا بنووسرێ نەک کە هات و کەوتە بەرایی وشەوە نیشانەکەی پشتگوێ بخری بە نامەی ئەوەی کە ڕێی پێشەوەی وشە هەمیشە قەڵەوە چونکە ئەم مەعلومات فرۆشییە ڕێ دەدات بەوەی نووسەر بە هەوەس هەموو لامەکانی بەرایی وشە بە لامی قەڵەو بنووسێت کە دەزانین لامی پێشەوەی وشە هەمیشە لاوازە. بەهەمەحاڵ لە چاپەمەنیدا ئەرکی ڕێی بە نیشانە و بێ نیشانە وەک یەکدییە چونکە قاڵبی حازربەدەست بۆ هەردووکیان هەیە و لە ژێر پەنجەی ڕێکخەرەکەشیان وەکوو یەکن.

لەبارەی واوی تیژی درێژەوە

وەک دیارە دوو ڕێگەمان لە پێشە بۆ بڕیاردان لەو کێشەیەدا، یەکیان ئەوەیە بە دوو واو بنووسرێ، دوەمیشیان ئەوەیە نیشانەی بۆ دابندرێت. ئەوانەی بە دوو واوی دەنووسن دەڵێن چونکە واوی درێژ دوو هێندەی کورتە بزوێنی بۆرە، «ضمة»ی عەرەبی، بۆریش بە یەک واو دەنووسین جێی خۆیەتی ئەویان بە دوو واو بنووسرێ. ئەم لێکدانەوەیە ڕاستی گەورەتر و گرنگتری لەبیر چووە:

یەکەم: دەبوو لە ڕێی قیاسەوە ئەلفیش بە دوو نیشانەی سەر «فەتحەی عەرەبی» بنووسرێ چونکە دەڵێن دەنگی ئەلف دوو هێندی دەنگی فەتحە درێژە؛

دووەم: واوی درێژ چ کراوە بێت «ۆ» و چ تیژ بێت یەک دەنگە نەک دوو دەنگ بەو پێیە یا دەبێ واوی کراوەش بە دوو پیت بنووسرێ یا واوی تیژ

نیشانەی بۆ دابندرێ. ڕاستییەکەی تێکرای دەنگە تەواوەکان بە کۆنستانت و بزوێنیەوە مافی ئەوەی دەبێ بە دوو پیت بنووسرێ.

سێیەم: کە کورتە بزوێن نیو هێندەی واوی تیژ بێ پێویستە خۆی بە نیو پیت بنووسرێ. مەنتیق داوا دەکات نیو دەنگ نیو پیتی پێ بدرێ نەک یەک دەنگ دوو پیتی پی بدرێ. وەک دەزانین لە عەرەبیدا ئەم مامڵەتە لەگەڵ کورتە بزوێنەکاندا کراوە کە هاتوە نیشانەی بۆ داناون نەک پیت. من ناڵێم کورتە بزوێن ببێتە نیشانە، بەڵام مەبەستم هەڵسەنگاندنی ئەو ڕایەیە کە لە ڕێی قیاسەوە بۆ واوی درێژ دوو پیت دادەنێ چونکە ئەو ڕایە دوای دانانی دوو پیت بۆ یەک دەنگ لە بیری دەچێ کە هەر بە پێی لێکدانەوەی خۆی کورتە بزوێن نیو دەنگە و دەبوو نیو پیتی پێ ڕەوا ببینێت. ئەم کورتیی و درێژییەی دەنگی واو، بە دوا ئەویشدا یێ، ناچارم دەکات پتر درێژە بە موناقەشەکەم بدەم و بڵێم ئەو کەسەی دەیەوێ خەریکی ئەلفوبێ و ڕینووس بێ لەسەریەتی شارەزای دەستوورە بنجییەکانی دەنگسازیی و وشەسازیی و ڕێزمان بە تێکڕایی و هی زمانی خۆی بە تایبەتی بێ چونکە پیتەکان یەکسەر پێوەندییان بە دەنگەکان و خاسیەتی هەریەکەیانەوە هەیە تێکبەستن و لێک ترازاندنی وشە و دەستەواژەش پێوەندیی بە وشەسازیی و ڕێزمانەوە هەیە. ئێمە کە دەڵێین واوی درێژ دوو هێندەی کورتە بزوێنی بۆرە، دەبێ بزانین کورتە بزوێنەکان هیچیان لە شێوەی کورتەبزوێندا درێژ کردنەوە هەڵناگرن، کە درێژ بوونەوە دەگۆڕێن بە بزوێنی درێژ. هەرچی بزوێنی تەواوە دەشێ بەقەدەر توانای ئاخێوەر درێژ بێتەوە.

بەشی هەرەزۆری کۆنسنانتەکانیش درێژ کردنەوە هەڵدەگرن. دەنگەکانی «خ، ڕ، ر، ز، ژ، س، ش، غ، ف، ڤ، ل، ڵ، م، ن – دەنگی ح، ه» جێی دەمەتەقەن دەشی بە ئارەزۆی ئاخێوەر درێژ بێتەوە. دەنگەکانی «ب، پ، ت، ج، د، ع، ئ

ک، گ» هیچیان ناشێ درێژ بکرێنەوە. بەو پێیە 14 دەنگی کۆنسنانت لە قابیلیەتی درێژ کردنەوەدا بارتەقای بزوێنە تەواوەکانن 10 دەنگی کۆنسنانتیش وەک کورتە بزوێن درێژ کردنەوە هەڵناگرن. ئنجا ئەوەی وا دەزانێ هەست کردن بە کورت بوونی هەندێ بزوێن یەکسەر دروست بوونی نووسینی دوو واو ئیسپات دەکات هاتوە نیگای خۆی لە تاکە دەنگی واوی کورت و درێژ قایم کردوە و بە لای ئەو ڕاستییە زێدە گەورە و گشتییەی دەنگەکاندا نەچووە کە قابیلیەتی درێژ بوونەوە هەر هی ئەلف و واو و یێ نییە، بێ قابیلیەتی درێژبوونەوەش هەر هی کورتە بزوێن نییە. لەمەوە دەمەوێ بڵێم درێژی و کورتی دەنگ دەخلی بەسەر «چەندایەتی» دەنگەوە نییە هەر وەک قەڵەوی و لاوازیش ئەو دەخلەی نییە.

جا لەبەر تیشکی ڕاستییەکانی دەنگسازیدا ڕێگە نابینم بۆ دانانی دوو پیت لەبری یەک دەنگ هەرچی دەبێ ئەو دەنگە با ببێ. لە لایەن دانانی دوو پیت بۆ دەنگی گوشراویش دەڵێم هەرچەند لە کوردیدا دەنگی گوشراو دەگمەنە دیسانەوە دەبێ لە ڕێنووسدا دانی پێدا بهێندرێ هەر نەبێ لەبەر ئەوەی بتوانین وشەی بێگانە کە گوشینی تێدا بوو بهێنینە سەر نووسینی کوردی بێ ئەوەی تەلەفوزەکەی بگۆڕین. من کوردم دیتوە توڕە بووە لە گۆڕانی ناوی کوردی کە بە ڕێنووسێکی بێگانە نووسراوە بەڵام هەر خۆی پێی ناخۆش بووە گوێ بدرێتە ئەو گوشینەی کە لە زمانێکی بێگانەڕا بەهۆی نووسینی دوو پیت هێنراوەتە سەر ڕێنووسی کوردی.

کەواتە ناشێ دوو واو لە بری تاکە دەنگی واوی تیژی درێژ بنووسرێ. دەمێنێتەوە ئەو نیشانەیە کە دەخرێتە سەری بۆ جودا کردنەوەی لە کورتە بزوێن. ئایا کەشیدە بێ وەک کە کۆڕ کاتی خۆی پێشنیازی کردبوو یاخود شتێکی دیکە بێ؟ لێرەشدا چ لایەنگیریم نییە بۆ هەر نیشانەیەکی پەسەند بکرێ، تەنانەت ئەگەر بۆ کورتە بزوێنەکەش شتێکی جوداکەرەوە پەیدا بکرێ چ ڕەخنەم نییە بەڵام ئەوسا لزوم بە نیشانەی واوەکە نامێنێ.

له بارەی بزوێنی «ی» تیژی درێژەوە

بەشێک لەوانەی بە ڕێنووسەوە خەریکن دەڵێن پێویست نییە ئەم بزوێنە درێژە لە کورتە بزوێنی ژێر جودا بکرێتەوە، گۆیا تەنها لە چەند وشەیەکدا هەست بە درێژ بوونەوەی بزوێنەکە دەکرێ.

دەزانم وشە هەن، کەمیش نین، وەک «پڵینگ، بیست، گوڵینگ، خرینگە، فریشتە، تەنیشت...» دەشێ بزوێنی «ی» یان تێدا کورتیش و درێژیش بکرێتەوە بەڵام دەبێ بزانین ئەمە دیاردەیەکی فۆنەتیکییە لەوەوە هاتوە کە دەنگێکی وەستاو کەوتۆتە دوای بزوێنی «ی» وە و بە دوا ئەو وەستاوەشدا دەنگی دیکە دێن و سەرلەبەری وشەکان جۆرێک درێژی پەیدا دەکەن مرۆڤ حەز دەکا بەهۆی کورت کردنەوەی بزوێنەکەی «ی» لەو ناڕاحەتییە دەرچێ. تۆ بێنە دەنگە وەستاوەکانی دوای «ی» ببزێوە و بڵێ «پڵینە، بیسوو، فریشا، تەنیشتی...» دەبینی بە دەست خۆت نییە مەیلت بۆ درێژکردنەوەی ئەو ییە دەچێ کە پێشتر حەزت دەکرد کورتی بکەیتەوە. وشەی وەک «جۆخین، گزیر، گوزین، سیخوڕ، بینین، تەنین، شیرازە، شیر، شوتی، دەرزی، نازوفیز...» هەرچی ییەکی تێیاندا هەیە بە ناچاری درێژ دەکرێنەوە مەگەر پیاو زۆر لە خۆی بکات و بە نیازی دەسەڵات تاقیکردنەوە لێیان کورت بکاتەوە. تۆ سەیری دەنگی واویش تا ڕادەیەک لەم خاسیەتەدا بەشدارە، بە نموونە وشەی «کورت، خورت، نورت و نوێ، شوست و شۆ، پوخت...» لەوانەن حەز لە بزوێنی واوی تیژی درێژ ناکەن.

کورتەی قسە ئەوەیە کە وا هەبوونی هەردوو دەنگی کورت و درێژی بزوێنی «ی» لە کوردیدا شتێک نییە دەمەتەقە هەڵبگرێ، دەمێنێتەوە بڵێین ئایا پێویست هەیە یا نییە بۆ جودا کردنەوەیان لە نووسیندا.

بێگومان جودا کردنەوەیان لە خوێندنەوەدا لە لایەن کوردەوە پەکی لەسەر دانانی نیشانە نەکەوتوە، تەنانەت دەتوانێ واوی کراوە و تیژ و کورتیش لە یەکدی جودا بکاتەوە بێ ئەوەی نیشانەیان بۆ دابندرێ لەوەشدا هەستی زگماگ بەکار دەهێنێ بەڵام دوو خاڵی گرینگ لەو کێشەیەدا هەیە نابێ بن لێو بخرێ

یەکەمیان ئەوەیە ئێمە بە تەماین ڕێنووس و ئەلفوبێی کوردی بە کێشانە و پێوانە و لێکدانەوەی زانستکارانە بچەسپێنین و لەبەر تیشکی مەنتیقدا بڕیاری بۆ بدەین.

دوەمیان ئەوەیە بێگانە لە خۆوە ناتوانێ فەرقی خوێندنەوەی یێی درێژ و کورت بکات ئەگەر لە نووسیندا ڕێنمایی نەکرێ.

ئنجا ئەگەر بڕیار درا کە بە پێی زانست و مەنتیق ڕێنمایی و فەرق کردنەکە پێویستە، سەرلەنوێ دەبێ ملکەچ بین بۆ ئەو بڕیارە بەدیهیەی کە دەڵی یەک پیت بۆ یەک دەنگ دابندرێ، ئەوەی ڕاستیش بێ مەنع کردنی دوو «ی» لە بری یێی درێژ پێویستترە لە مەنع کردنی دوو واو چونکە تەنها لە وشەی وەک «کاوووس، تاوووس»دا سێ وا بە دوا یەکدیدا دێن و کەچی وا دەبێ توشی وشەی وەک «لادێییی» دێین کە بە پێی نووسینی دوو یێ لە بری یێی تیژی درێژ چوار یێ بە دوا یەکدیدا دێن، ئنجا ئەگەر «ی» ئیزافە وەیا وەسفیشمان خستە دوایانەوە دەبنە پێنج یێ وەک «لادێییی شارەزوور». لەو تەرزە وشانە وشەی «سەرجێییی، سەرپێییی، هەرمێییی، مێیینە، گرِوێییی، شلوێییی»م بە بیردا دێن. خۆ و تالع ناوەکانی «شنەروێ، پەسوێ، کەڵوێ، بێژوێ...» لە حاڵی نیسبەتدا یێی کۆتاییان دەبێتە کورتە بزوێنی سەر (فەتحەی عەرەبی) دەنا ئەوانیش وەک «لادێییی» چوار یێیان بە دوا یەکدیدا قەتار دەکرد بەڵام دەگوترێ «پەسوەیی، کەڵوەیی، بێژوەیی» نەشمبیستوە لەگەڵ «شنەروێ»دا چ دەکرێ. جا پێویستە بە لای منەوە، بە

لای واقعیشەوە، ییی تیژی درێژ لە نووسیندا لە کورتە بزوێنی یێ جودا بکرێتەوە. ئەوەی کارەکە لەبەر مجێزی نووسەری کورددا قورس دەکا شکڵی «ی» یە بە خۆی و دوو نوختەی ژێریەوە بەو هەموو لەیەکچوونەی لەگەڵ «ب، پ، ت، ن» ی ناوەڕاستی وشە. ئەگەر «ی»ش وەک «و» وێنەی لاتەریکی هەبوایە بە ئاسانی پیتی کورت و درێژی لێکتر جودا دەبوونەوە. بە هەمە حاڵ «ی» پەل نیشانەی حەفتێکی بچوکی بۆ داندراوە، جا ئەگەر هەشتێکی بچووک بخرێتە سەر ییی تیژەوە گۆیا چ ناقولاییێک ڕوو دەدا. کاتی خۆی کە لە ئەنجومەنی کۆڕ لە ڕێنووسمان دەکۆڵیەوە پێشنیازی من ئەوە بوو کە نیشانەی سەر پیتەکان بریتی بێ لە حەفتی بچوک و هەشتی بچوک بەڵام وا پەسەند کرا کە لە جیاتی نیشانەی «٨»ی بچوک کەشیدە بچێتە سەر واو و ییی تیژی درێژ.

پێویستە لێرەدا شتێک بگوترێ لەبارەی هەڵەیەکی بنجی کە لە جووتە پیتی «و، ی»دا کراوە. زۆر بە سەیری دانەرانی ڕێچکەی ئەلفوبێی نوێی کوردی هاتون شکڵی «و»ی سادەیان بۆ واوی کۆنسنانت و کورتە بزوێنی بۆر داناوە، شکڵی «ی»شیان بۆ «ی» کۆنسنانت و کورتە بزوێنی ژێر داناوە کەچی دەبوایە ئەم دوو شکڵە بۆ واو و ییی کۆنسنانت و واو و ییی تیژی درێژ دابندرێت چونکە ئەوان دەنگی سەربەخۆ و تەواون نەک کورتە بزوێنەکانیان کە دەزانین بە عادەت لە کورت کردنەوە و لێبڕینەوەی دەنگی بزوێنی درێژی واو و یێ پەیدا دەبن. ئەگەر کاتی خۆی چارەی کورتە بزوێنی بۆر و ژێر کرابایە وەک کە بە ڕێکەوت چاری فەتحە کرا دەمایەوە جودا کردنەوەی واو و ییی کراوە لە هی تیژ کە بەهۆی نیشانەی «٧»ی بچوک جودا کراوەتەوە. هەرچی واو و ییی کۆنسنانتن هەڵەیان تێدایە ناکرێ. واو و ییی کۆنسنانت لە سێ شوێندا دێن 1- لە سەرتای وشەدا. 2- لە دوای بزوێنەوە. 3- لە پێش بزوێنەوە. لەم سێ شوێنەدا ئیمکان نییە بزوێنی واو و یێ بێت. لەم نموونانەی خوارەوەدا دەبێ واو و ییەکان هەر کۆنسنانت بن

وەرە، گەورە، سروە، واز، کەوەر.
یار، دایک، مایە، سەیران، گەمیە.

وشەی «سروە« بێنە و بزوێنەکەی کۆتایی لێ بستێنە بە ناچاری واوە کۆنسنانتەکە دەبێتە بزوێن چونکە کۆنسنانتەکەی پێش خۆیەوە وەستاوە. وشەی «گەمیە»ش بزوێنی کۆتایی لێ بستێنە ییەیە کۆنسنانتەکەی دەبێتە بزوێن چونکە بە دوا کۆنسنانتی وەستاودا دێت. لەمەوە دەردەکەوێ واو و یێی کۆنسنانتی وەستاو بە دوا دەنگی وەستاودا دەبنە بزوێن.

ئەم ڕچە پڕ هەڵەیەی لەیەک چواندنی شکڵی کورتە بزوێنی «و، ی» لەگەڵ شکڵی «و، ی» بزوێنی درێژ وەها نەقش بەستوو بووە تازە بە کەس هەڵناوەشێتەوە. لەبەر ئەمە هەر دەمێنێتەوە نیشانە بۆ دوو دەنگی واو و یێی تیژی درێژ دابندرێت، پێشنیازی منیش لەوەدا دانانی نیشانی «٨»ی بچوکە کە بریتیە لە هەڵگێڕانەوەی حەفتە بچوکەکەی سەر واو و یێی کراوە.

لە بارەی دالی کلۆرەوە

ئاشکرایە دەربڕینی دەنگی دال بە شێوەی کلۆر کراو لە هەندێ باردا تایبەتیەکی ئاخاوتنی سلێمانییە، وەک دەشزانین ئەو دالانە هەر دالی عادەتین و کلۆر دەکرێن نەک دالی وشەی ناسراوی وەک صادەکەی وشەی «صەد». وا دەزانم کێشەی ئەم دالە بە دواکەوتنی ناوێ چونکە لە هیچ کوێرە ڕێگایەکەوە ڕەوا نییە جۆری دەربڕینی تایبەتی دەنگ لە لایەن بەشێکی خەڵقەوە بەسەر هەموو زماندا بسەپێ، ئنجا ڕەنگە زوربەی هەرە زۆری میللەت نەتوانێ دەنگەکە بەو شێوە تایبەتییە دەربڕێ. لەوەش بەولاوە، دالی کلۆر بە پێی هەڵکەوت و جێگەی لە وشەدا شیوەگۆڕی دەکات وەک کە لە دوای نوونی وەستاودا بەرەو گاف دەڕوات وەیا لە دوای «ر»دا گۆڕانی

بەسەردا نایەت وەک «کورد، بەرد، مرد، کردم...». ئێمە کە بزانین لە وشەی «بەغدا، ئەحمەد» دا دالێکی عادەتی زەق و تەق هەیە و زوربەی هەرە زۆری کورد دەیڵێتەوە، چۆن دەشێ لە نووسیندا پیتی دالەکە بشێوێنین وەیا بقرتێنین هەر هەتا هەڵەی تێدا بکەین. پێویستە ئەو دالانە بە عادەتی بنووسرێن، خوێندنەوەشیان بدرێتە زەوقی خوێنەر وەک کە دەنووسین «ماڵ، کڵاو» خۆشناو و دزەیی و ڕەواندزی و کۆییش دەخوێننەوە «مار، کراو».

هەر لەگەڵ دەنگی کلۆری دالدا دەنگی «ت» کلۆریش لێدوان هەڵدەگرێ هەرچەند چ کەسێکیش لە نووسیندا چ نیشانەی بۆ دانەناوە، پێشنیازیشی نەکردوە. باس کردنی تێی کلۆر جگە لەوەی باسی دیاردەیەکی بەرهەستە سوودی بێ بایەخ کردنی دالی کلۆریشی هەیە چونکە هەردویان ئاوی یەک سەرچاوەی فۆنەتیکین.

ئەوانەی دال لە شوێنی تایبەتیدا کلۆر دەکەن، لە شوێنی تایبەتیدا «ت»ش کلۆر دەکەن وەیا تێی دەبەن وەیا دەیگۆڕن وەک وشەی «مەتبەخ – مطبخ» دەکەن «موبەق». ڕەنگە چی لە بارەی دەنگی دالەوە بگوترێ لە بارەی ئەم دەنگەشەوە بگوترێ. هەردوویان دیاردەی فۆنەتیکی ناوچەیین و شێوە ڕاستی ئەو وشانەی دەنگەکانیان تێدا دەگۆڕێ ئاشکرا و زیندون، هەندێکیان وشەی بێگانەن و بەشی هەرەزۆریان کوردین و لە لایەن زورەبەی کوردەوە بە دروستی دەردەبڕدرێن. دیارە بە لای باوەڕی منەوە کلۆر کردن و گۆڕینی دەنگی «ت»ش هی بایەخ پێدان نییە لە ڕێنووسدا. وشەکان وەک بە لای کوردەوە ڕاستە وەها دەنووسرێن خەڵقیش بە پێی دەستوورانی دەنگسازی ناوچە ئازادن لە چۆنیەتی خوێندنەوەیان.

کە قسەم ئێستا ڕووی لە لەهجەی ناوچەییە وا بە باش دەزانم باسی دیفتۆنگەکانی «وێ، نگ» بۆ ئێرەکانە پێش بیەخم چونکە ئەوانیش شێوە دەربڕینی ناوچەیین نەک دیفتۆنگی ڕەسەنی کوردی.

جارێ با لە پێشەوە بزانین دیفتۆنگ چییە. دیفتۆنگ ئەو دەنگەی ئاخاوتنە کە تامی دوو دەنگی سەربەخۆی ئاخاوتنی تێدا بێ، بەڵام هیچ کامێکیشیان نییە. لە کوردیدا باسی تریتۆنگ نایەتە ناوەوە چونکە لە کەسی کورد نەبیستراوە دەنگی وەها بەکاربهێنێ لە ئاخاوتندا تامی سێ دەنگی تێدا بێ.

مەرجی سەرەتایی و بنجی ئەو تەرزە دەنگانەش ئەوەیە کە دەبێ وەک دەنگەکانی دیکە لە خۆوە هەبن نەک بە ڕێکەوت لە کەوتنە تەنیشت یەکتری دوو دەنگ پەیدا ببن چونکە لەم حاڵەتەدا دەنگە تێکەڵەکە دەبێتە یاردەی دەربڕینی ناوچەیی نەک دەنگی نژادی زمانەکە، تەنانەت وا دەبێ ئاخێوەری سلێمانی ناوی وڵاتی «کوێت» دەهێنێتە سەر شێوەی دەربڕینی کوردی و کافەکە وەک کافی وڵاغی «کوێت» دەردەبڕێ، دەشڵێ «مەرەکەبی کوینک». ئەم نموونەیەم لە دەرەوەی یاردەی دیفتۆنگەوە هێنا بۆ تەنها مەبەستی گۆڕینی دەنگ بە پێی هەڵکەوتی لە وشەدا. نموونەیەکی ڕوونکەرەوەی دیکەی هەڵکەوتی دەنگ لە وشەدا لە زمانی فرەنسیەوە دەهێنم. دوو وشەی de, le کە دیفتۆنگیان تێدایە کاتێک کەوتنە بەرایی وشەیەک کە بە دەنگی هەمزە دەست پێدەکا دیفتۆنگەکەیان تێدەچێ وەک کە لە جیاتی le ecole دەڵێن l'ecole و لە جیاتی de Artagnan دەڵێن d' Artagnan.

لە بارەی «وێ»وە وەک لە وشەکانی «خوێ، نوێژ، توێژ، سوێ، دوێنێ»دا بە پێی دەربڕینی دانیشتوانی سلێمانی و هەندێ جێگەی دیکەی کوردەواری دەبیسرێ. لێرە بە پێشەوە لە نووسینی دیکەمدا بە درێژی لەم کێشەیەم کۆڵیوەتەوە. لێرەدا ناچارم بەو بەڵگانەدا دێمەوە کە بە پێی ڕای خۆم گرفتەکە ڕوون دەکاتەوە، کەم و زۆر بەڵگەی تازەش دەخەمە بەر گوێی گوێدێرانەوە، ڕەنگە بەڵگەش هەبێ گلم دابێتەوە بۆ هەلی بیندرێژتر و لێکۆڵینەوەی قووڵتر و لەسەرەخۆتر...

ئەوەی بەلام وەک بەدیهیە وایە ئەوەیە کە دیفتۆنگی «وێ» لە ڕاستیدا دیفتۆنگ نییە بەڵکوو واوی کۆنسنانت و بزوێنی «ێ»ی کراوەیە و بەشی هەرە زۆری کورد بەو جۆرەی دەردەبڕن کە لە کۆنەوە گوتراوە و نووسراویشە بەڵام بەشێک لە دانیشتوانی هەندێ ناوچەی کورد لە شێوەی دیفتۆنگ دەریدەبڕن، واتە دیفتۆنگەکە هی زمانی کوردی بەرفرەوان و ڕەسەن نییە.
لەم جۆرە دەربڕینە ناوچەییە دیفتۆنگی دیکە هەیە کە سەرنجی نووسەرانی ڕانەکێشاوە و نەبووە بە جێی پرس و لێکۆڵینەوەش. یەکێک لەمانە دیفتۆنگی لامی قەڵەوی بڵە کە بریتییە لە تێکەڵ بوونی دوو دەنگی «ر»ی لاواز و لامی قەڵەو. ئەم دیفتۆنگە لە لایێکەوە خۆی ڕەسەن دەنوێنێ چونکە هەڵکەوت پەیدای ناکات، لە چەند لایێکیشەوە ناڕەسەنایەتی و نادروستی خۆی بە دەستەوە دەدات، یەکیان لەوەدا کە ئەویش وەک لامی قەڵەو وشەی عەرەبیش دەگرێتەوە نەک هەر کوردی وەک «حەڵاڵ، ماڵ، کامڵ».
دوومیان لەوەدا کە ئەگەر ئاخێوەر لە منداڵییەوە فێری نەبێ بە گەورەیی بۆی ڕام نابێ، بە پێچەوانەی لامی قەڵەو کە هەموو کورد بگرە زۆرینەی ئادەمیزاد دەتوانن فێری بن. دیارە کە دەنگێک لەوانە نەبێ میللەتەکەی فێری بێت هی ئەو میللەتە بە تێکڕایی نییە. سێیەمیان لەوەدا کە ئەم دەنگە زێدە لە هەموو کۆنسنانتێک گوشین هەڵناگرێ. سەرەڕای ئەم لایەنانە ئەویش وەک لامی قەڵەو نایەتە بەرایی وشەوە. ئنجا کە ئەم هەموو گرفتانە بێنە بەر دەنگێک دیارە مافی نامێنێ لەوەدا کە پیتی تایبەتی بۆ دابندرێ وەیا بەسەر هەموو میللەتدا بسەپێندرێ.

ئێستا با بزانین بە چدا مەعلوم دەکرێ کە دیفتۆنگی «وێ» ش ڕەسەن نییە بەڵکوو واو و یێیە عادەتیەکەیە لێرە و لەوێ شێوەی دیفتۆنگی پەیدا کردوە.

یەکەم لە کۆنەوە وشەکان بە دوو پیتی تەواوی واو و یێ نووسراون و بە پێی بە دوا یەکتردا هاتنیشیان لە نووسیندا گوتراون و خوێندراونەتەوە. وشەی «نوێژ، درێژ» هەردوویان وەک یەکدی نووسراون، ئەوسا نیشانەش نەبوو

لەسەر «ی»کە دابندرێ و بە سەلیقە دەخوێندرایەوە «نوێژ، درێژ» نەک «نۆییژ، دریێژ». بێگومان ئەگەر دڵنیا نەبانایە لە ڕاستی وشەکە گرفتێکیان دەهاتە بەر و لێی دوودڵ دەبوون وەیاخود دەیاننووسی «نیۆژ، دیۆنیٚ» هەروەک هەندێ کەمزان هەن دەڵێن «سیۆر» لە بری «سوێر».

دووەم لە شیعری شاعیرەکانی باباندا ئەم وشانە کە هاتبن وەک کە نووسراون خوێندراونەتەوە. بە نموونە نالی دەڵێ

هەر جۆگە و جێگایە کەوا سور و سوێر بێ
جێی جۆششی گریانی منە خوێ نەڕژاوە

وشەی «سوێر» ئەگەر دیفتۆنگ بێ کێشی شیعرەکە تێک دەچێ. هەر نالی لە بەیتێکی دیکەدا دەڵێ

بولبول کە گەرمی نەغمەیە ئاگر دەکاتەوە
غونچە حەزینە جەرگ و دڵی بۆ دەکا توێ

لێرەشدا ئەگەر وشەی «توێ» دیفتۆنگی تێدا بایە هەم کێشی بەیتەکە تێک دەچوو هەم قافیەشی دەگۆڕا چونکە وشەکە هاوقافیەی «هۆردوێ، نادوێ»یە. جارێکیان لە کۆبوونەوەی لیژنەیەکی کۆڕی زانیاری کورد ئەم پرسیارە لێی کۆڵرایەوە یەکێک لە ئەندامانی ئەوسای لیژنەکە و ئێستاکەی دەستەی کوردی کە مەیلی بەلای دیفتۆنگدا دەچوو بە بیستنی ئەم جۆرە نموونانە سەلماندی کە وشەکان واو و ییان تێدایە نەک دیفتۆنگ، هەر ئەمەیشە گیانی زانستپەروەر کە سەرپێچی لە ئاست ڕاستیدا ناکات.

سێیەم بەشی هەرەزۆری کورد لەو وشانەدا واو و یێ دەردەبڕێ و دیفتۆنگەکە بە زمانیدا ناهێنێ و پێشی ناکرێ دەریببڕێ هەر ئەمیش ڕێک

دێت لەگەڵ نەبوونی دیفتۆنگ لەو وشانەدا وەک کە لە شیعریشدا دیفتۆنگیان تێدا نەبوو.

چوارەم ئەم دیفتۆنگە تەنها لە بەشێکی وشەی وەهادا خۆی بەسەر شێوە ئاخاوتنی هەندێ ناوچەدا دابڕیوە، هەرچی فیعلە واو و یێیەکەی وەک خۆی دەمێنێتەوە. دەڵێن «دەدوێ، دەڕوێ، دەئاخێوێ، دەسوێ...». ڕەنگە هۆیەکی پەیدا نەبوونی دیفتۆنگ لەو فیعلانەدا ئەوە بێ «ێ»کەیان لە ئەلفەوە هاتوە چونکە چاوگ و ڕابردوویان «دوان – دوا، ڕوان – ڕوا، ئاخاوتن – ئاخاوتی، سوان – سوا»یە. وەیاخود زیادییەکی گەردانە لە فیعلی تێپەڕدا بە دوا کەسی سێیەمی تاکدا دێت وەک «دەئەنگێوێ، دەبزێوێ، دەئاخێوێ». ئەم فیعلانە کە درانە کەسی یەکەمی تاک و دووەمی کۆ و سێیەمی کۆ «ێ»کەی کۆتاییان هەر پەیدا نییە هەتا خەیاڵ بۆ دیفتۆنگ بڕوات، دەڵێ «من دەئەنگێوم، ئێوە دەبزێون، ئەوان دەئاخێون». لە کەسی یەکەمی کۆ و دووەمی تاکدا یێی تیژ نەک کراوە بە دوا واوەکەدا دێت کە ئیتر ناشێ دیفتۆنگەکە خۆ بسەپێنێ. هۆیەکی دیکەی زێدە بنجی هەیە نایەڵێ دیفتۆنگەکە لەو تەرزە فیعلانەدا دەرکەوێ. سەرنج بگرە دەبینیت کە دەڵێی «دەئاخێوێ، دەئەنگێوێ، دەبزێوێ...» بزوێنی «ێ»ی کراوە دەکەوێتە پێش «وێ»وە ئنجا کە ئەم دوو دەنگەی «وێ»یە بکرێنە دیفتۆنگ دەبنە یەک دەنگی بزوێن، بەم جۆرە بزوێن دەکەوێتە پاش بزوێن دەشزانین ئیمکان نییە بزوێن سواری بزوێن بێ لە بۆیە بە ناچاری وشەکان لەسەر دەقی خۆیان دەمێننەوە و هەموو کورد یەک جۆریان دەردەبڕن.

وشە هەن، ناو و ئاوەڵناو جارێ دیفتۆنگەکەیان تێدا دەرنەکەوتوە وەک «بلوێر، زەنوێر». وا پێ دەچێ تەمەنی ئەم دیفتۆنگە لەو شێوە ئاخاوتنەدا زۆر درێژ نەبێ بۆیە ئەو وشانەی بە نوێیی دەکەونە بەر گوێی دانیشتوانی ئەو ناوچانە بەهۆی تازەیی ڕاهاتنی خەڵقەکە بەو دیفتۆنگە وەک خۆیان دەمێننەوە. بەڵگەیەکی دیکەی تازەیی ئەم دیفتۆنگە لەوەدا پەیدایە کە ئەو کۆمەڵە ناوەی

«عەلەم»ی «شنەروێ، کەڵوێ، پەسوێ، بیژوێ»ش بێ دیفتۆنگ بە دەقی خۆیان لە سلێمانی و ناوچەکانی دیکەدا دەگوترێن. ئەم بەڵگەیە کە بەراورد بکرێ لەگەڵ گۆڕینی دەنگی کافی «کوێت» بۆ کافە کلۆرەکەی کوردی باشتر نوێ بوونی دیفتۆنگەکە ئیسپات دەکا چونکە ڕەسەنایەتی و کۆنایەتی کافی کلۆر لە کوردیدا خۆی بەسەر وشەی بێگانەشدا سەپاندوە کەچی تازەیی دیفتۆنگەکە وای لێ کردوە بە بەشێکی کەمی وشەی کوردی بوێرێ، چ جایی بێگانە.

ئەم درێژەیەم بە بەڵگەی چوارەم دا هەر لەبەر ئەوەی بۆ بیسەر و خوێنەری کوردی ڕوون بکەمەوە کە چۆن بڕیاری چۆنیەتی دەربڕینی دەنگ لە ڕێزمان و فۆنەتیک و وشەسازییەوە لە خۆوە دەردەچێ بێ ئەوەی ئاخێوەر هەستیشی پێ بکات، نەخۆ وا دەزانم سێ بەڵگەی سەرووتر بەسن بە ئیسپات گەیاندنی ڕەسەن نەبوونی ئەو دیفتۆنگە.

با لێرەدا لە جیاتی ئەو کەسانەی سوورن لەسەر دیفتۆنگەکە بەڵگە بهێنمەوە و وەرامیان بدەمەوە.

ڕەنگە بەڵگەی یەکەم ئەوە بێ کە دیفتۆنگەکە هەیە و ئینکار ناکرێ. لە وەرامی ئەوەدا دەڵێم

1- هێزی ئەم بەڵگەیە هەر هێندەی بەڵگەی ئەوانەیە کە لە ئاخاوتندا ئەو واو و یێیانە بێ دیفتۆنگ دەردەبڕن. جا ئەگەر خاوەن دیفتۆنگەکە بڵێ من چ بکەم لەوەدا کە دیفتۆنگەکە لای من هەیە، ئەوی دیشیان دەڵێ من چ بکەم دیفتۆنگ لای من نییە.

2- ژمارەی ئاخێوەری بێ دیفتۆنگ شەش حەفت هێندەی ژمارەی ئاخێوەری بە دیفتۆنگ دەبێت. بەو پێیە بەڵگەی لایەنی نەبوون چەندین جار بەسەر بەڵگەی لایەنی بووندا ڕادەشکێ.

3- دیفتۆنگی لامی قەڵەوی بڵیش هەیە بەڵام هەبوونەکەی نەبۆتە بنۆس بۆ سەپاندنی بەسەر نووسیندا، بگرە هەر قسەشی لێوە نەکراوە.

ڕەنگە بەڵگەی دوەمیش ئەوەبێ بگوترێ چونکە دیفتۆنگەکە لە لەهجەی سلێمانیدا هەیە ئەو لەهجەیەش بنەمای زمانی ئەدەبی کوردییە پێویستە دانی پێدا بهێندرێ و لە ڕێنووسدا جێی بۆ بکرێتەوە. لە ئاست ئەم بەڵگەیەشدا وەرام هەن

1- لەهجەی سلێمانی کە جێی خۆیەتی ببێتە بنەمای نووسینی ئەدەبی کوردی ئەوەندە لایەنی بەهێز و جوان و ڕاست و ڕەسەنی تێدا هەیە کە پێویستی بە سەپاندنی شتی نارەسەن نەبێت. خزمەتی شێوە نووسینی ئەدەبی و شێوەی ئاخاوتنی سلێمانی خۆیشی لەوەدایە کە هەر وشە و تەعبیر و دارشتنێکی کوردی لە ڕەسەنایەتی و ڕاست بووندا بەسەر هی دیکەدا کەوتەوە ئەویان قبووڵ بکرێ نەک جوانی و ئاورینگی لەهجەی بنەمای ئەدەبی شەفاعەت بکەن بۆ ئەو بەکارهێنانەی نادروستن و لەگەڵ خۆیدا بەسەر هەموو زمانەکەیاندا بسەپێنێ.

2- لە زمانی فرەنسەیی، کە شیوە ئاخاوتنی شاری پاریس بۆتە بنەمای شیوە ئەدەبیەکەی نەهاتوون شکڵی پیتی «ر» بگۆڕن بەو «غ»ەی کە پاریسیەکان لە جێی «ر»ی دادەنێن. ئاخیوەری پاریس «ر»ەکە دەنووسێت و بە غەینی دەخوێنێتەوە، ئاخێوەری سلێمانیش وەک هی پاریس دەتوانێ وشەکان بە ڕاستی بنووسێت و لە خوێندنەوەشدا بە پێی ڕاهاتنی خۆی دەریانببڕێت، هەروەک کۆیە و خۆشناو و دزەیی لامی قەڵەو و بە «ڵ» دەنووسن و لە ئاخاوتندا دەیانکەنە ڕێی لاواز.

3- گرفت و ڕەخنە هەر لە دیفتۆنگدا نییە، شێوە ئاخاوتنی سلێمانی، وەک هەموو شێوەیەکی پێشکەوتووی ئەم جیهانە کە بە جۆرێکی خۆڕسک و بێ

مامۆستا بەسەر زمانی دانیشتوەکانیدا هاتوە بە پێی بڕیاری واقیع تایبەتی وەهای تێدا پەیدا بووە کە لە ئەسڵی زمانەکەدا نییە، ناوناوە هەڵەشی تێکەوتوە. بە نموونە کە دەگوترێ «بێرەوەوانێ، لەماڵەوەوانێ» هیچ کوردێکی دەرەوەی سلێمانی بە بیریدا نایەت لە لای خۆیەوە شتی وەها بڵێ وەیا بنووسێ، ساڵەهای ساڵیشی بەسەردا تێدەپەڕێ بەر لەوەی بزانێ ئەم «وانێ»یە بە دوا کام وشەدا دێت. «ر»ەکەی «بچۆرەوە»ش کە لە جیاتی «بچۆوە« بەکار دێت، ئەویش بۆ کوردی دەرەوەی سلێمانی لەمپەڕێکی ئاخاوتن و نووسینە، ئنجا لزومیشی نییە، کەسیش نازانێ لە کوێوە ئەم «ر»ە پەڕیوەتەوە بۆ ناو ئەم ڕێژە فەرمانەی کار.

لە ئاخاوتنی سلێمانیدا لایەنی دیکەش هەن کە لێرەدا جێی باس کردنیان نابێتەوە پێویست دەکا نووسەران و زمانناسان بۆیان کۆببنەوە و دەستنیشانیان بکەن و چی هەڵەی تێیاندایە ڕاستیان بکەنەوە وەک کە دەگوترێ «تیایا — لەبری تێیدا» وەیا «یەت — لەبری دێت، دەهێت» و هی تریش.

شێوە ئاخاوتنی پێشکەوتوو لە هەر زمانێکدا بێ ناشێ ناتەواویەکانی خۆی بەسەر شێوە نووسینی ئەدەبیدا بسەپێنێ. بە نموونە، ئەگەر شێوەی ئاخاوتنی تەهران بیەوێ ببێتە زمانی نووسین و ئەدەب هەموو تاروپۆی زمانی یەکگرتووی فارسی لەبەریەک هەڵدەوەشێنێ، جا ئەگەر کوردیش وەک فارسی دەقی کۆنینەی ئاخاوتنی مابایەوە بۆ ئیمڕۆ دەماندیت هەموو شێوە جوداکانی ئێستاکەی ئاخاوتنی کوردی بەقەدەر دوور کەوتنەوەی ئاخاوتنی تەهران لە زمانە نژادیە پاراستراوەکەی فارسی، لەهجە کوردییەکانیش لەو زمانە ڕەسەنە نژادییە دوور کەوتونەتەوە. عەیبی لەهجەکانی کوردی بەوە داپۆشراوە کە شێوەی ئەسڵە کوردییەکەی بەر لە دابەش بوونی بەسەر ئەو هەموو لەهجەیەدا لە کۆنەوە تۆمار نەکراوە. ئنجا کە ئێمە نەتوانین هەموو گۆڕانە بەرەو شێواویەکەی لەهجەیەک ببەینەوە بۆ سەرچاوە دێرینە ڕاست و دروستەکەی ئەوەندەمان هەر بۆ دەمێنێتەوە کە هەڵەی زەق و زۆپ ببینین

هەر نەبێ لە ڕێی بەراورد کردنی ناوخۆیی کوردی و بەراورد کردنی لەهجە جوداکانی لەگەڵ ئەو زمانانەی خزمایەتییان بە کوردییەوە هەیە. بە هەمە حاڵ کە ویسترا بەکارهێنانی نارەوای لەهجەیەک بەسەر هەموو زمانەکەدا بسەپێ خەڵق لێی دڕدۆنگ دەبێ.

هەر لەم کولانەیەوە سەیرێکی دیفتۆنگی «نگ» دەکەم. وەک لە خۆوە دیارە هاتنی نوونی وەستاو لە بەرایی دەنگی گافدا دیاردەیەکی ئاساییە بەقەدەر هاتنی نوون لە پێش کاف وەیا تێ - دا. ئەمە ڕاستییەکە هیچ دەمەتەقە هەڵناگرێ، لەوە بەولاوە پرسیار هەڵدەستێ کە ئەگەر بەشێکی کوردزمان لە دراوسێیەتیی دوو دەنگدا دیفتۆنگی دروست کرد هەموو کوردزمان چی بکا؟ زمانە ئەدەبیەکەی چۆنی مەملەت لەگەڵدا بکا؟ ڕێنووس و ئەلفوبێ لە ئاستیدا چ هەڵوەستێکی هەبێ؟

ئێمە ئەگەر نەمانزانیبایە دیفتۆنگەکە لە چییەوە هاتوە ڕێی تێدەچوو لەوە بکۆڵرێتەوە ئایا ناوچەییە یا نژادی، تا ئەگەر نژادی بێت نیشانە وەیا پیتی بۆ دانبندرێ. بەڵام هەمووومان دەزانین نوونێکی بێ دەمەتەقەی وەستاو دەکەوێتە بەرایی گافێکی بێ دەمەتەقەوە و لە لەهجەی سلێمانی و ناوچەیەکی تەسکدا منگە و «غنە»یەک لە نێوان دوو دەنگەکەدا پەیدا دەبێ کە زەحمەتە لە زار و زمانی دانیشتووی غەیری ئەو ناوچەیە دەربێت، تەنانەت ڕەنگە بە دەرس دانیش فێری نەبن. جا کە حاڵ ئەمە بێ چیمان لە پێشدا دەبێ مەگەر ئەوەی کە نوون و گافەکە وەک هەن بیانووسین و خەڵقیش بە پێی ڕاهاتنی زمانیان بیانخوێننەوە، ئەوساش هەمووومان لەیەکدی ڕازی دەبین چونکە وشەکان بە دروستی دەپارێزرێن و ناشارەزای ئەو دیفتۆنگەش ناچار ناکرێ بە گوتنەوەی شتێک کە لە وزەیدا نییە.

ئەمەی گوتم بۆ خۆی بەسە بۆ ڕەواندنەوەی گرفتەکە و وەرامی پرسیارەکە چونکە شتێکی وەک بەدیهیە وایە چەند ڕاستی دیکەی زۆر بەهێز لە لاوە دێن و پشتگیری لەو ڕایە دەکەن.

ڕاستی یەکەم ئەوەیە کە دەنگی نوون لە لەهجەی سلێمانیدا لە بەرایی دەنگی دالیشدا منگە و غوننە پەیدا دەکات، دەربڕینەکەشی زەحمەتترە لە منگەی نێوان نوون و گاف، بەو پێیە دەبێ خەریکی چارەسەر کردنی ئەو گرفتەش بین تا ئەگەر بڕیار درا منگەکە بەسەر نووسیندا بسەپێ خەریک بین مامۆستا بدۆزینەوە بۆ ڕاهێنانی هەموو کورد لەو دەربڕینە یەکجار تایبەتی و ئەستەمە. هەڵبەت کە پیتێکی کەس نەدیتوو و نەبیستوو دابهێنین لە بری «نگ» و «ند» کە وا نە نوون بێت و نە گاف و نە دال دەبێ لەو تەرزە وشانەدا ڕاستییە ڕەسەن و دروستەکانیش بکوژین و لە بیر خەڵقیان ببەینەوە. دەمەوێ لە خۆم بپرسم ئایا ئەمە چارەسەر کردنە یاخود شەڕ پێفرۆشتنە؟

ڕاستیی دووەم ئەوەیە کە منگە و غەننەکە لە حاڵەتی وەستان لەسەر گاف و دالەکە بە ئاشکرایی پەیدایە، کە هاتیت بزوێنت بە دوادا هێنان دەچنە بارێکی دیکە لە زۆر وشەشدا هەر بە جارێ دەبنە نوون و گاف و دالی عادەتی وەک «بەندەر، سەنگەر، چەنداوەکوو، کوندی لەسەر سندی، شەنگە بی، ڕەند...».

ڕاستی سێیەم ئەوەیە کە هەندێ جار لە زاری سلێمانیدا دەنگی دالی دوای نوون دەکرێتە گافی بێفێڵ وەک «ئەفەنگی، مەنگ، تونگ، دەربەنگ...» ئایا لەگەڵ ئەمانەدا چی بکەین؟

ڕاستی چوارەم ئەوەیە کە دیاردەی فۆنەتێکی ئەوتۆیی لە زۆر حاڵەتی دیکەدا دەردەکەوێ بێ ئەوەی نون و گاف وەیا نوون و دال لە بەیندا بێ وەک کە نوونی وەستاو دەکەوێتە پێش دەنگی «بێ» دەبێتە میم. بە نموونە «عەمبار،

شەمبە، پەمبە، عەمبەر، قەمبەر...» لەبری «عەنبار، شەنبە، پەنبە، عەنبەر، قەنبەر...» وشەی «بەرانبەر» کە بۆتە «بەرامبەر» لە ڕێژەی «سەرانسەر، دەوراندەور»ە و نوونەکەی لە نووسیندا بە هەڵە دەکرێتە میم. نوونی پێش دەنگی «پ»ش هەر دەبێتەوە میم. لە بەرایی دەنگی «ف»شەوە حەز دەکا بەرەو میم بچێتەوە وەک لە عەرەبیدا وشەی «ینفی» لە «یمفی» نزیک دەبێتەوە، تەنانەت دوو دەنگی «ف، ث» کە لە بیستندا زەحمەت جودا دەکرێنەوە هەر کە دەنگی نوونیان لە پێشەوە هات بە تەواوی لە یەکدی دەترازێن وەک «ینثر، ینفر» چونکە نوونی پێش دەنگی «ث» وەک خۆی دەمێنێتەوە هی پێش فێیەکەش لە میم دەچێ. لامی وەستاو لە بەرایی تێی قەڵەو دەبێت و تێیەکەش دەبێتە «ط» وەک «گاڵتە، خڵتە، قەڵتارە...». وشەی «کلتوور – بە واتای کلدان» ئەو گۆڕینەی تێدا نییە چونکە لە دوو وشەی «کل» و «توور» پێک هاتوە. کاف و گاف کە بزوێنی «ی، ێ» وەیا «وی، وێ»یان بە دوادا هات دەنگیان دەگۆڕێ. تێکرای ئەم گۆڕانانە دیاردەی دەنگسازین و دەخلیان بەسەر ڕێنووسەوە نییە.

باوەڕم هەیە، ئەوانەی گوتمن بەس بن بۆ وەرام دانەوەی پرسیار لە گرفتی دیفتۆنگی «وێ، نگ». بەڵام ماوەتەوە بڵێم لە زاری کرمانجی سەروودا دیفتۆنگی ئەو دەنگەی کە لە تێکەڵ بوونی واوی درێژ و یێی درێژ پەیدا دەبێ دیفتۆنگێکی ڕەسەن و بنجییە لەو ڕووەوە کە دیفتۆنگەکە لە وشەی مەعلومدا دەردەکەوێ و بەردەوامیشە وەکوو هەر دەنگێکی دیکەی سەربەخۆی ئاخاوتن، جا ئەگەر یەکێک لەهجەکە نەزانێ و وشەکان نەناسێ ناتوانێ لە ڕێی دەستووراتی دەنگسازییەوە دیفتۆنگەکە بناسێتەوە وەک کە لووس بوونی کاف و گافی پێش «ی» وەیا منگەی نوونی پێش گاف بە سەلیقە دەزانێ. کاتی خۆی ئەنجومەنی کۆڕی زانیاری کورد بە بیریدا نەهات پیت بۆ ئەم دیفتۆنگە ڕاستینەیە دابنێ تاکوو لە خوێندنەوە و نووسینی ئەو وشانەی دیفتۆنگەکەیان تێدایە هەڵە نەکرێ. بێگومان دەبێ چارەسەری ئەم گرفتەش بکرێ.

ب- بۆ تێگەیشتن لە مەبەستی ئەو پرسیارە گەڕامەوە لای بەرپرسەکانی ئەم کۆڕە چونکە لە ئاست ئەم پرسیارەدا بیر بۆ چەند لایەک دەڕوات وەک دەنگی «ض، ص، ط، ظ...» کە لە کوردیدا نین و ناوناوەش کارمان پێیان دەبێ هەر نەبێ لەو دەمەی کە لە نووسینی کوردیدا ئیشارە بۆ ئەو دەنگانە وەیا دەنگی دیکەی بێگانە دەکەین... بیر بۆ ئەو دەنگانەش دەڕوا کە پێیان ناگوترێ دەنگی زمانی وەک فیکە و مرخەی مرۆڤ و کیفەی مار و ورشەی با... بیرم بۆ ئەو دیفتۆنگەی زاری کرمانجی سەروش چوو کە دەمزانی بە بیراندا نایەت... لە وەرامدا پێیان گوتم مەبەست ئەو دەنگەیە کە لە عەرەبیدا پێی دەڵێن «کسرة مختلسة» وەک دەنگی دوای دەنگی «چ» لە وشەی «پنچک» -دا.

بەر لە ئێستاکە لەم دەنگە دواوم و لە سەریم نووسیوە، ڕەنگە لەم ڕۆژەی 8-3-1980 تا دەمی بەستنی کۆڕی گیروگرفتەکان گوتاری دیکەشم لە بارەی ئەم دەنگەوە دەربچێت، ئیتر نازانم ئایا مافی سێبارە کردنەوەم دەمێنێ؟ لە گوتاری «فۆنەتیک چیمان بۆ بکا؟» کە لە بەشی یەکەمی بەرگی سێیەمی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد – ساڵی 1975 – دا بڵاوبۆتەوە لە گەڵێک سەروبەری دیاردەی ئەم دەنگە بێهێزە دواوم، ئەوەی بیەوێ دەتوانێ بۆ ئەو گوتارە بگەڕێتەوە و بیروباوەڕی منی تێدا بخوێنێتەوە. لێرەدا زۆر بە کورتی لەبارەی دەنگەکەوە دەدوێم.

بەر لە هەموو شتێک دەڵێم من ئەم دەنگە بە بزوێن دانانێم و هەمیشە پێم گوتووە قورس کردن چونکە لە دربڕیندا مەبەست بزاوتنی دەنگی پێش خۆی نییە بەڵکوو مەبەست ئیمکان بوونی دەربڕینی دەنگەکەیە. ئەمە لە سەرێکەوە، لە سەرێکی دیکەشەوە ئەو قورس کردنە بەشێکی بنجی و هەمیشەیی وشە نییە، چونکە کە باری دەربڕینی وشە گۆڕا قورس کردنەکە هەڵدەستێ و دەچێتەوە. هەروەک بەشێکی تاکە وشە نییە لێکنەری دوو وشەش نییە کە لە دراوسێیەتییان قورس کردنەکە دەبێتە کارێکی ناچاری.

بەڵگەی ئەوەی کە بەشی بنجی و هەمیشەیی وشە نییە لەم نموونانەدا دێتە بەرچاو. وشەی «شێلم» قورس کردنی تێدا دەکەوێتە سەر دەنگی «ل». کە هاتیت و میمەکەت بزاوت و گوتت «شێلمەکە» قورسایی سەر لامەکە نەما. هەروەهاش کە دەڵێی «گەنم – گەنمەکە، بەفر – بەفرۆکە، قەسر – قەسرین» قورسایی نوونی گەنم و فێی بەفر و سینی قەسر دەڕەوێتەوە.

بەڵگەی ئەوەی کە لێکنەریش نییە لەم نموونانەوە دەردەکەوێ: کە دەڵێی «دڵم» قورسایی دەچێتە سەر لامی قەڵەوی وشەی «دڵ». کە گوتت «دڵمان» وەیا «گوناهی دڵمە» قورساییەکە دەپووچێتەوە.

چاوگی بەستن، کردن، قورسایی لەسەر دەنگی پێش نوونی چاوگی هەردوو وشەدا هەیە بەڵام کە گوتت «بەستنەوە، کردمانەوە« دەتوانی قورساییەکە تێببەیت دەشتوانی بیهێڵیتەوە.

ڕاستییەکەی ئەم قورس کردنە ناچاریەکی فۆنەتیکییە لە کاتی پێویستدا بۆ دەربڕینی وشە پەیدا دەبێ، ناوناوەش بە نیازی تەئکید، کە هەر دەکاتەوە پێویستی، دەخرێتە سەر دەنگێکی وشە وەیا نێوان دوو وشە، هەر کە پێویستییەکەش نەما قورس کردنەکە لە خۆوە بزر دەبێ. وردبوونەوە لە تایبەتی دەنگەکانی کوردی دەری دەخا کە ئەم دەنگە لە ڕووی بوون و نەبوونەوە سێ پلەی هەیە. پلەی یەکەم ئەوەیە کە لە هەندێ حاڵەتدا هەر دەبێ هەبێ وەک لە وشەی «شێلم، گەنم، بەفر، کەسر، سەپک...»دا قورس کردنی دەنگەکانی «ل، ن، ف، س، پ» ناچارییە، تا بزوێنێک دێت و قورساییەکە هەڵدەگرێ. پلەی دوەم ئەوەیە کە لە هەندێ باردا دەشێ قورس کردنەکە هەبێ و دەشێ نەشبێ وەک لە وشەی «دەنک، مەرج، سەخت، کەشک...»دا دەشێ دەنگەکانی «ن، ر، خ، ش» قورس بکرێن و نەشکرێن. پلەی سێیەم ئەوەیە کە دەنگی «ر» لە پێش «د، ت»دا قورس کردن

هەڵناگرێ. هەروەهاش دەنگی «ن» لە پێش «د، گ» و دەنگی «س، ش» لە پێش «ت»دا...

ئەمانە ڕاستی و تایبەتی هەندێک لە دەستوورەکانی فۆنەتیکی کوردییە، درێژەشیان لێرەدا جێی نابێتەوە. قورس کردنی دەنگیش لە وشە وەیا لە نێوان دوو وشەدا دەکەوێتە بەر حوکمی ئەو دەستووره فۆنەتیکییانە. لەمەوە و لە گەلێک لێکدانەوەی دیکەش دەردەکەوێ کە ئەم قورس کردنە بەشی بنجی ئاخاوتن نییە، بوون و نەبوونیشی لە وشەدا بەندە بە جێگەی وشە وەیا جۆری دەربڕینی لە ئاخاوتندا، دۆزینەوەی ئەو جێگە و جۆرەش کاری سەلیقەیە. لەبەر ئەمە وا دەزانم پێویست نییە دیاردەکە بە گرفتی ڕێنووس لە قەڵەم بدرێت بە تایبەتی کە نووسینمان بەو پیتانە بێ وا لە باودان.

بێت و ئەو قورس کردنە بەسەر نووسیندا بسەپێ زوربەی وشەکانمان دوو جۆر نووسینیان دەبێ، یەکیان بە قورس کردن ئەوی دیکەشیان بێ ئەو. بە نموونە کە وشەی «شێلم»ت نووسی دەبێ قورسایی بدەیتە لامەکە. کە گوتت «شێلمم کرِی» قورساییەکە دەچێتە سەر میمی شێلم. کە گوتت «شێلمتان کرِی» قورساییەکە دەگەڕێتەوە بۆ لامەکە. دیسانەوە کە گوتت «شێلمم کرِی» ڕێت هەیە لامەکەش و میمەکەش بە یەکەوە قورس بکەیت بەڵام کە گوتت «شێلمتان کرِی» تەنها لامەکە قورسایی هەڵدەگرێ. بە هەمە حاڵ هەست کردن بەو تەرزە هاتوچۆیەی قورس کردنەکە لە هیچ مامۆستا و دەرسدەرێکەوە وەرناگیرێ. هەستێکی زگماکە، وەیا هەرنەبێ فرچک گرتنێکی منداڵییە بە زمانی دایکزاوە. لێکۆڵینەوەی ئەم گرفتە لەگەڵ پیتی عەرەبیدا، لە سەرەتاوە، بێ جێیە، کاتێک باس لە ئەلفوبێی لاتینی کرا دەشێ تۆژینەوە لە چۆنیەتی نووسینی وشە و ڕستەی کوردی بە پیتی لاتینی بکرێ.

ج- پلەی دەنگە بزوێنەکان

بزوێن دوو جۆری بنجی هەیە

1- بزوێنی درێژ.
2- کورتە بزوێن.

لە کوردیدا بزوێنی دیفتۆنگ کە هەبێ لە جۆری درێژدا پەیدا دەبێ. بەلای منەوە دیفتۆنگ هێندەی بزوێنەکانی دیکە بنجی نییە چونکە لە تێکەڵ بوونی دوو دەنگ پێک دێت، وەک موتوربەی کە لەسەر ڕەگی خۆی شین نابێ. چی لەم بەندەشدا بە گرفت داندراوە تەنها لە بارەی «و، ی»وەیە، هەرچی ئەلف و دیفتۆنگە جێی لێدوان نین.

ئەوەی ڕاستی بێ دەبوو ئەم گرفتەش هەر بخرێتەوە ژێر بەندی «أ» خاڵی یەکەم کە لە پیتی بزوێن و نەبزوێنی نیشانەدار دەکۆڵێتەوە، دیارە کە لە واو و یێی نیشانەدار دواین بە ناچاری لە هی بێ نیشانەش دەدوێین. لێرەدا کورتەیەکی ئەو لایەنانە دەنووسم کە پێوەندی بە پلەی دوو بزوێنی «و، ی»وە هەیە.

1- لە بارەی «و»ەوە واوی درێژ وەک پێشتریش گوتمان دوو جۆری هەیە، واوی تیژ، قوچاو و واوی کراوە، پەل. هەرچی کراوەیە هەموو لەسەر ئەوە ڕێک کەوتون کە نیشانەی حەفتی بچوکی بۆ دابندرێ. واوی تیژ جارێ ڕێککەوتن لەسەر چۆنیەتی نووسینی پەیدا نەبووە. بەڵام لە ڕووی پلەی دەنگەوە دەبێ ئەوە بزانین کە کورتە بزوێنی واو کورت کراوەی واوی تیژە، واوی کراوە لە کوردیدا شێوەی کورتی نییە. هەر ئەم ڕاستییەش بەڵگەی ڕەسەنایەتی و بنجی بوونی واوی تیژ پتر بەهێز دەکا و ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە واوی کراوە بریتییە لە واوێکی تیژ و نەختێک تامی دەنگی ئەلف، بەڵام پێی نەگوتراوە دیفتۆنگ. جا ئەگەر بمانەوێ سەرجوملەی دەنگ و ڕەنگی واو

و پەیدا بوونیان و خوار و ژووریان بکەین بە لیستە ئەم ڕیزە واوە بە دوا یەکدیدا قەتار دەبێ

- واوی کۆنسنانت کە بنەمای هەموو شێوەکانی دیکەی واوە وەک لەم وشانەدا دەبیسترێ وزە، وەرە، ڕاو، ڕەو، دێو، هەویر، هەوار.
- واوی تیژی درێژ وەک لە وشەکانی دوور، کاووس، بەڕوو، هەیوولا... دەبیسترێ.
- واوی کراوەی درێژ وەک خۆڵ، برۆ، سەرکۆنە...
- دیفتۆنگی واوی درێژ لە زاری کرمانجی سەروودا.
- کورتە بزوێنی بۆر – ضمەی عەرەبی- وەک «کورت، ڕوسم...» ئەم واوەیان دەنگێکی ناتەواوی ناسەربەخۆیە و بە دوا کۆنسنانتدا دەشێ دەرکەوێ و لە کورت کردنەوەی واوی تیژ پەیدا دەبێ.

2- لە بارەی «ی»وە

ئەم بزوێنە لە درێژ کردنەوەی ییی کۆنسنانتەوە شکڵی دەنگی یێی تیژی درێژ وەردەگرێ. کورتە بزوێنی ژێریش کورتەی ئەم یێیەیە. هەروەها یێی کراوەش بە تێکەڵ بوونی تامێکی دەنگی ئەلف وەیا کورتە بزوێنی سەر لەگەڵ یێی تیژی درێژ پەیدا دەبێ بەڵام ئەویش پێی نەگوتراوە دیفتۆنگ.
سەرلەبەری جۆرەکانی «ی»ش بە بزوێن و کۆنسنانتیەوە ئەم لیستەیە پێک دەهێنن

- ییی کۆنسنانت وەک «دایک، یار، هەیتە، مەی، مەیاس».
- یێی تیژی درێژ وەک «پیتاک، جوانی، بینین، گۆلاوی...».
- یێی کراوەی درێژ وەک «ڕێ، شوێن، دوێنێ، ڕدێن...».
- کورتە بزوێنی یێ کە پێی دەگوترا ژێر وەک «گزینگ، بیست...».

بەڵام دەبێ بزانین کە ئەم کورتە بزوێنە لە زوربەی هەرە زۆری وشەکاندا دەشێ درێژ بکرێتەوە واتاش نەگۆڕێ، وشەی وەهاش هەیە کورتە بزوێنەکەی درێژ ناکرێتەوە وەک کە دەڵێی «لەسەر شینگ و تاقەتی خۆی...» وەیا «ڕینگەی لە هەناویەوە هات...».

دیفتۆنگی نێوان واو و یێ لە بنەڕەتدا واوە یێی تێکەڵ دەبێ بۆیە بوو خستمە لیستەی بزوێنی واوەوە.

ئەو دەنگەی من ناوم نا قورس کردن بەلای زۆر کەسەوە ناوی بزوێن هەڵدەگرێ، بەڵام سەرەڕای ئەوەی کە من بە بزوێنی دانانێم چونکە دەنگێکی بێلایەنە نابردرێتەوە بۆ هیچ یەکێک لەو بزوێنە بێگومانانە، لەبەر ئەمە نابێتە «پلە» مەگەر بێین و لە خۆڕایی قبووڵ کەین کە وا عەرەب گوتەنی «کسرة مختلسة»یە و بیکەینە پلەی سەرەتایی بزوێنی «ی». بەهەمەحاڵ ئەگەر ئەزموونی ئەلیکترۆنی ئیسپاتیشی کرد کە قورس کردنەکە بەرەو «کسرە»وە دەڕوات دەبێ بزانین کە قورس کردنی واوی کۆنسنانت بەرەو «ضمە»یەوە دەبات چونکە دەنگی «ضمە» لە سروشتی دەنگی واودایە. لەگەڵ خۆتدا بڵێ «کاوڕ، کەوڵ، وزە، وڵە، لاوک...» هەست دەکەیت لە دەربڕینی واوەکەدا تامی «ضمە» هەیە هەر بۆیەیشە زۆر لە نووسەران ئەو تەرزە وشانە بە واوێکی کۆنسنانت و یەکێکی بزوێن دەنووسن. شتێکی دیکەش هەیە لەم بابەتە فۆنەتیکییە بە هەست ڕاگرتن و لێ وردبوونەوە خۆ ڕوون دەکاتەوە. ئەو دەنگەی بە دوا قورسکردنەکەدا دێت دەخلی هەیە بەسەر جۆری دەربڕینی دەنگە قورس کراوەکە. لە وشەی «کەڵب، گەرم»دا چونکی دەنگی «ب، م» بە دوا لامە قەڵەوەکە و ڕێیە لاوازەکەدا دێت قورس کردنەکە حەز لە خزمایەتی «ضمە» دەکات نەک کەسرە چونکە هەردوو دەنگی «ب، م» لەوانەن لێو پێکدا دەدروون و بەرەو ئەو شکڵەیەوە دەبەن کە لە دەربڕینی دەنگی «و»دا وەری دەگرن. دەنگەکانی «ب، پ، م، ف، ڤ» هەر پێنجیان لەم بابەتەن.

## بەشی 2: گیروگرفتی وشەی سادە و دارِێژراو

ئەم سەرەباسە لە بانگەوازەکەدا بە دوو بەند دابەش کراوە.

أ- ناوی عەرەبی.

ب- پێشگر – پاشگری «پێناسین» و «کۆ».

هەرچەند نازانم ئاخۆ نووسەرانی بانگەوازەکە وایان داناوە وشەی سادە بەر بەشی «ناوی عەرەبی» دەکەوێت و وشەی دارِێژراویش بەر بەشی پێشگر، ئنجا پاشگری پێناسین و کۆ دەکەوێت، یاخود پرسیارەکە بەلای ئەوانەوە جۆرێکی دیکەیە کە من بۆی ناچم، دیسانەوە پرسیارەکە ناتەواوە و وەرام دانەوەی بەرەو هیچ کوێیەکمانەوە نابات.

لە بارەی بەندی «أ – ناوی عەرەبی»یەوە چەند تێبینییەک خۆ بەسەر زیهندا دەبرِێ.

1- نووسینی ناوی عەرەبی لەوەدا گرفت پەیدا ناکات ئایا سادەیە یا دارِێژراوە، گرفتەکە لەوەدایە ئایا ناوی عەرەبی بە پیتی کوردی و رِێنووسی کوردی بنووسرێ یاخود بە پیت و رِێنووسی عەرەبی؟ کە بە کوردیمان نووسی چ لە دەنگی وەک «ض» بکەین؟ کە بە رِێنووس و پیتی عەرەبیشمان نووسی ئایا بیخەینە ناو کەوانەوە یاخود بێ کەوانە بکەوێتە نێوان وشە کوردییەکانەوە؟

2- نەک هەر ناوی عەرەبی بەڵکوو هەموو ناوێکی غەیری کوردی ئەم کێشەیەی چۆنیەتی نووسینی بەدوادا دێت لەوەدا ئایا بە پیتی کوردی بنووسرێن یاخود بە پیتی زمانەکەی خۆیان؟

3- له لایەن سادە و ناسادەییشەوە ناوی کوردی و بێگانەش هەموو جۆرێکی هەیە نەک تەنها ناوی عەرەبی. بەولای سادە و دارِێژراوەوە ئاوێتەشی هەیە. واوەی سادەوەش هەیە بریتییە لە یەک پیت وەک «مستر X» .

کاتی خۆی ئەنجومەنی کۆڕ بڕیاری لە بارەی چۆنیەتی نووسینی ناوی غەیری کوردی ئەوە بوو کە ئەگەر ویسترا وەکوو خۆی ڕاگوێزرێ دەبێ بە پیتی زمانەکەی خۆی لە نێوان دوو کەوانەدا بنووسرێ، ئەگەر ویستراش وەک ئەوەی کە کورد دەریدەبڕێ بنووسرێ ئەوسا بێ کەوانە بە پیتی کوردی و ڕێنووسی کوردی دەنووسرێ. لەمەدا چ گرفت پەیدا نییە بەڵام کە ویسترا ناوی ئەو زمانانە بنووسین کە لە چاپخانەکانی عێراقدا وێنەی پیتیان بۆ دانەڕژاوە هیچ چارە نییە مەگەر ئەوەی بە پێی تەلەفوزی خۆمان بە ڕێنووسی کوردییان بنووسین. هەڵبەت پێویستە لەو بارانەدا کەرتی سەربەخۆی ناوی ئەجنەبی لە کوردیشدا سەربەخۆ بنووسرێ بە نموونە ناوی «تریڤگی لی» نابێ ببێتە «تریگ ڤیلی» وەیا «برناردشۆ» ببێتە «بر ناردشۆ». وا دەزانم ئەو تەرزە بڕیارانەش لە ڕادەی بەدیهیەدان.

ب- لە بارەی ئەوەی بانگەوازەکە پێی دەڵێ «پێشگر – پاشگری» «پێناسین و کۆ».

ڕاستیەکەی نە نیشانەی «پێناسین» و نە هی «کۆ» هیچ کامێکیان پاشگر نین چونکە پاشگر دوو مەرجی بنجی تێدایە

1) ببێتە کەرتێکی وشە.

2) پاشگرەکە جۆرێک گۆران لە واتای وشەکەدا پەیدا بکات.

باسی مەرجی لکان و بە دوادا هاتن نابەمە دوو مەرجەکەی سەرەوە چونکە وا دەبێ وشە دێت بە پێش خۆیەوە دەلکێت کەچی پاشگر نییە وەک کە دەڵێی

«نووسیمان» ڕاناوەکە بە دوای کارەکەوە لکاوە وەیا دەڵێی «لە بیتوێندا دەژیم» «دا»کەی دوای بیتوێن تەواوکەری پریپۆزیشنی «لە»یە.

پێکهێنەری ناسین و پێکهێنەری کۆ هەر وەک پاشگر نین ئامرازیش نین، چونکە ئامراز لە ڕستەدا دەور دەبینێت نەک لە پێکهێنانی وشە، بە عادەت هەبوونی سەربەخۆشی هەیە و بە دەگمەن نەبێ لە نووسیندا بە وشەوەش نالکێ. هەرچی ئەو دوو پێکهێنەرەیە پتر بە لای نیشانەدا دەچنەوە وەک نیشانەی نەفی و نەهی. نازانم بۆچی بانگەوازەکە بەلای چەندین پاشگری ڕاستینەی ناو و کار و هی تریشدا نەچوە و تەنها یەخەی ئەم دوو ناپاشگرەی گرتوە... لەمەش زیاتر، هیچ تروسکەی نەداوینێ «سادە» و دارێژراوی پێ بناسینەوە وەیا مەبەست لە پێشگر و پاشگر چییە چونکە ئەم زاراوانە لەوانەن نووسەران و زماناسان بەرەو ئامانجی لەیەکدی دوور ببەن.

بە هەمەحاڵ لێرەدا چی لە مەفهومی ئەو پرسیارانەوە بە بیردا بێت وەرامیان دەدەمەوە داخیشم ناچێ کە مومکین نەبوو پرسیار لە هەموو ئەندامانی لیژنەی ڕێکخەری بانگەوازەکە بکەم نەشم دەتوانی جار لە دوای جار پرس بە تاک تاکیان بکەم بۆیە وەها خودبەسەر مل بە وەرامەکان دەنێم ئیتر کوردی گوتەنی «ئەڵڵای ورمان لە جێی نەرمان»...

ناوی کوردی و چۆنیەتی نووسینیان نابێ وەک ناوی کۆک (اسم العلم Proper noun) گرفت لە نووسینیان هەبێ چونکە هەرچی ناوی کۆکە چ سادە بێت و چ دارێژراو چ لێکدراو چ ئاوێتە بێت بە یەک وشە حیساب دەکرێ و کەرتەکانی تاکە ناوێک، وەک تاکە وشە پێکەوە دەلکێن وەیا بەسەر یەکەوە دەنووسرێن وەک «کاکەڵڵا، زێندین، پیربال، دڵشاد، گوڵبەدەم...» بەڵام ئەو ناوانەی کە لەقەبی واتاداری نەشێواویان پێوەیە وەک «مام ئۆمەر، خاڵ گدروون، ئاغا مستەفا» بەیەکەوە نووساندن هەڵناگرن چونکە ئەمانە لەقەبەکانیان وەک لەقەب ماونەوە و دەقی خۆیان پاراستوە و هیچ نەگۆڕاون

وەک کە «زێندین، کاکەڵڵا» بەو لێکدرانە تێکەڵی و شێواوییان بەسەرداهاتوە. لەگەڵ ئەمەشدا پێویستە هەردوو کەرتی ناوەکە لە یەکدی نزیک بنووسرێن.

ئەو ناوانەی کە لەقەبی «ئاغا»یان بە دوادا دێت، بە تێکڕایی، لە نووسیندا چوار ئیحتیمال هەڵدەگرن 1- بە تەواوی بەیەکەوە بلکێن. 2- نەختێک لەیەکدی جودا بکرێنەوە بێ ئەوەی پیتی هەمزە بەسەر وشەی «ئاغا»وە بمێنێ. 3- هەمزەکە بمێنێ و وشەی «ئاغا» لە نزیک ناوەکەوە بنووسرێ. 4- هەردوو وشە بە تەواوی لەیەکدی داببڕێن، ئەمەش هەر چوار جۆری نووسینەکە حوسێناغا – حوسێن‌اغا – حوسێن‌ئاغا – حوسێن ئاغا.

گرفتی نووسینی ئەم تەرزە ناوە لەوەوە دێت کە لە ئاخاوتندا هەمزەی وشەی «ئاغا» بە تەواوی دەسوێت و دەمێنێتەوە دەنگی بزوێنی ئەلف کە بە ناچاری خۆ دەداتە پاڵ وشەی پێش خۆیەوە. ئنجا ژیاندنەوەی هەمزەکە لە نووسیندا دەبێتە کارێکی ناقۆڵای ناواقیعی. بێگومان کە نووسیمان «حوسێن‌ئاغا» خوێنەرە ناجار دەکەین بە پێچەوانەی عادەت گرتنمان لە خوێندنەوەدا گیان بە بەر هەمزەکە بێنێتەوە، ئەوساش دەڵێی وشەکە لە دەمی بێگانەی نەشارەزاوە دەردێت. ڕەنگە وا باش بێ لە نووسیندا هەمزەکە بسوێت بەڵام ئەلفەکەی بێ هەمزە بە وشەی پێشیەوە نەلکێت وەک کە واوی «عطف» بە دوا کۆنسنانتدا بە جودا لە دورەوەی وشەی پێشیەوەی دەنووسین هەرچەند لە خوێندەوەدا دەیکەینە بزوێنی کۆنسنانتەکە. بەڵام لە نووسینی ناوی «حەماغا»دا پێویستە ئەلفەکە بە پێش خۆیەوە بلکێ چونکە وشەکە بە ئەسڵ حەمەد بووە، بە لێقرتاندن بۆتە حەمە، ئنجا بزوێنەکەی کۆتاییشی قرتاوە واتە شێواویەکی ئەوتۆی بەسەردا هاتوە داخوازی مامڵەتی تایبەتی بکات. هەر ناوێکی دیکەش لەم جۆرە بوو بەر ئەم دەستوورە دەکەوێت وەک ناوی «عەوڵاغا»، ئەگەر نا دەبێ بنووسین عەبدوڵڵا ئاغا وەهاشی بخوێنینەوە. بە شێوەیەکی گشتی هەر ناوێک شێوانی تێدا پەیدا بووبێت ناشێ لە نووسیندا ببرێتەوە بۆ ئەسڵەکەی وەک «بلە، سمکۆ، مچە، خولە، فالە - لە «فارس»ەوە

هاتوه، قاله...» چونکە خاوەنەکانیان بەم ناوانە نەبێ ناناسرێنەوە مەگەر بە هەردوو ناو لە کۆنەوە ناسرابن وەک «سمایلاغای شکاک، سمکۆ – ئیبراهیم ئەحمەد، بلەی ئەحە ڕەش – عەلی اغای خورشیدی بایزی، عەلۆی خورشید – عیززەدین شێر – یەزدان شێر...» لە شوێنێکی وەک سلێمانی تا نەڵێی «قالەی ئایشەخان، حەمەی ئاوڕەحاماناغا» بە چاکی نازانرێ مەبەستت کێیە، لە کۆیەش بڵێی «حەمەداغای مەحمووداغا» کەس بیری بۆ «حەماغا»ی گەورە ناڕوا. لە هەولێر نەڵێی «مەلافەندی» نازانن مەبەستت مەلا ئەبوبەکری کوڕی حاجی عومەرەفەندییە...

ناو هەیە وەک بەگزاد – بەگزادە - سەیدزادە - مەلازادە - شێخزادە دەبێ کەرتەکانیان بەیەکەوە بلکێن هەم لەبەر ئەوەی کە ناوی کۆکن هەم لەبەر هۆیەکی دیکە کە ئێرە جێی لەباری باس کردنیەتی.

ئەم ناوانەی وشەی «زاد»یان بە دواوەیە دەچنە ڕیزی وشەی لێکدراو کە لە کەرتێکی واتادار و کەرتێکی واتا ناتەواو پێک دێن بەزۆریش کەرتی دوەمیان تەواوکەری وشەی فاعیلی داڕێژراون وەک «نانخۆر، جلدروو، بنبزێوکە، ئاوخۆرەوە...» ناوناوەش مەفعوولی داڕێژراو دروست دەکەن وەک «مەلاخۆرە، بەگزادە، ئاوخۆرک، دزنەبەرەی گورگ نەخۆرە، سەردڕ، عەنبارەسۆت...».

کاتی خۆی کە لە ئەنجومەنی کۆڕ دەمەتەقە لەسەر چۆنیەتی نووسینی ئەم تەرزە وشانە هەڵستا بڕیار وەها دەرچوو کە ئەو وشەیەی بووبێتە ناوی کۆک (اسم علم) وەیا وشەی فەرهەنگی بە یەک وشە حیساب بکرێت و کەرتەکانی بەیەکەوە بلکێن. هەرچی من بووم وام پەسەند دەکرد وشەکان هەمیشە بەیەکەوە بلکێن ئەویش لەبەر دوو هۆی بنجی:

1- زوربەی ئەو کەرتە تەواوکەرەی کە لە فیعلەوە دێن بە تەنها واتا نابەخشن تا بە دوا وشەیەکی دیکەدا دێن بە تەواوی وەک پاشگرەکانی وشەی «نانەوا، پاسەوان، هونەرمەند، بەختەوەر...» کە ئەمانیش بە تەنها واتابەخشن و لە هەموو بارێکدا بە وشەی پێش خۆیانەوە دەلکێندرێن.

2- ئەگەر مامڵەت جودایی بکەین لە نووسینیان گەلێک وشەی کوردی بە دوو جۆر دەنووسرین وەک کە گوتت «دڵسۆز برادەرێکی دڵ سۆزە» دەبێ جارێکیان هەردوو کەرتی «دڵ سۆز»ەکە بە یەکەوە بلکێن جاری دووەمیشیان لە یەکدی بترازێن. ئەم هۆیەیان دەبێتە هێز بۆ هۆی یەکەم نەخۆ بە تەنها زۆر گرنگ نییە.

ئنجا بەلای منەوە دەبێ ناوی کۆک و وشەی فەرهەنگی و وشە دارِێژراوەکانی باسکراو هەموویان لە نووسیندا کەرتەکانیان بەیەکەوە بنووسین.

- نموونەی ناوی کۆک وەکوو کاکەڵڵا، خوادای، ئاورِەحمان، گەلاوێژ، خەزەڵوەر، بنگرد، سێوەسەن، پێبازۆک، باکراوا، چوارتا، حەسەنکیف، سەردەشت، دۆڵەمۆمن...

- نموونەی وشەی فەرهەنگی وەکوو جلدروو، دارتاش، چێشتخانە، نەخۆشخانە، ئیستگە، مامۆتک، مامۆستا، شێرپەنجە، گوریسکێشەکێ، سێباز، کلکتەقێنە.

- نموونەی وشەی دارِێژراوی فاعیل وەک دەسبرِ، پیرِەوکە، دڵدەرەوە، شەرمهێن، دەسکەوت...

- نموونەی وشەی دارِێژراوی مەفعوول وەک مەلاخۆرە، دزنەبەرە، ئاوشۆرک، سەردرِ...

وشەی دیکەش هەن لەم بابەتە بوونەتە ناوی ئالەت وەیا یاری وەیا هەر شتێکی دیکە بێ وەک پارزۆنگ، دەسگرە، دەسشۆر، پێمبەرِە، پانیکێش، نانبرێشک، ئەوانیش بە پێی دەستوورەکە و دەستووری وشەی فەرهەنگی دەبێ کەرتەکانیان بەیەکەوە بلکێن.

هەڵبەت وشەی وەک لێنەر، تێکبەستە، پێکەڵ، رِایەخ، پێخور، پێخەف، دانەر، هەڵتەک کە هیچ کەرتێکیان بە تەنهایی واتا نابەخشێ بەولاتەریقەوە دەبێ بەیەکەوە بنووسێن.

ناوی گشتی ئاوێتەی وەک «بنبەردەقیلە، سەرهەڵقەنە، سەربەکڵاوە، قسەتێنەوەستاو، گوریسکێشەکێ» هەڵدەگرێ بەیەکەوە بلکێن و لە یەکدیش بترازێن بەمەرجێک کەرتەکانیان لەیەکدی نزیک بنووسرێن چونکە ئەم وشانە کۆمەڵێک کەرتی سەربەخۆیان تێدایە هەموشیان دەقی خۆیانیان پاراستووە. هەر لەم کولانەیشەوە دەتوانین بۆ وشەی وەک «بێدین، بەدین، لێزان، بۆچوون...» برِۆین. ئەم وشانە دەچنە رِیزی ئەو وشانەی پێشگر وەیا پاشگریان هەیە دەبێ بەیەکەوە بلکێن.

کێشەی پاشگر گەلێک ئاسانترە لە هی پێشگر و بە کورتی دەشێ برِیار لەسەر ئەوە بدرێ کە هەرچی پاشگرە بە کەرتی پیش خۆیەوە بلکێ چ لە فیعل و چ لە غەیری فیعلدا بێ وەک ماڵدار، دەوڵەمەند، بەختیار، هاتنەوە، هەڵستاو، سووتاندن، رِەواندنەوە، خنکێنراو، بیژۆک، ئاگرۆچکە، پیاوەتی، مەردایەتی، پیاوانە، کوڵکن، گێژەن...

هەرچی پێشگرە وەها مام سەلمێن نییە، بەڵام دەشێ نەختێک لەبەر یەکی هەڵوەشێنین و بۆ ناوتوێژەکانی ببینەوە.

لە پێشەوە با قسە لە پێشگری فیعل بکەین

کاتی خۆی ئەنجومەنی کۆڕ پێشنیازی کرد کە ئەو پێشگرەی یەکسەر دەکەوێتە پێش فیعلەوە پێوەی بلکێت وەک هەڵکەوتن، تێبردن، دەرکەوتن، وەرگەڕان، ڕاهێنان، پێکەنین... بەڵام کە لەمپەڕ هاتە نێوانیانەوە دەبێ پێشگرەکە جودا بکرێتەوە بە مەرجێک لە نزیک فیعلەکەوە بنووسرێت وەک لێمانبورد، هەڵیاننەدەگرت...

ئەو لەمپەڕەی کە دەکەوێتە نیوان پێشگر و فیعل یەکێکە لە سێ شت

1- ڕاناوی لکاو وەک هەڵمگرت، تێمانگەییشت، دامانناا.

2- پێشگرێکی دیکە وەک لێهەڵستان، پێتێکردن، پێلێکردنەوە.

3- یەکێک لە نیشانەکانی «ئەمر نەهی، نەفی، مضارعة» وەک هەڵبەستە، تێمەکە، وەرناچەرخێ – وەرنەچەرخا، هەڵدەگرێ.

ئەگەر لەمپەڕەکە ڕاناو بوو بە پێی دەستووری ڕاناوی لکاو دەبێ ڕاناوەکە بە پێشگرەکەوە بنووسێت و بە جووتە لە نزیک فیعلەکەوە بنووسرێن وەک هەڵمگرت، دەرتاندا، وەریگرت، تێیانپەڕاند. هەڵبەت دەستوورەکە ناگۆڕێ ئەگەر گوترا «پێیاندادەنێرم، تێیڕادەڕۆم، تێیەوەدەچین» بەڵام لە حاڵەتێکدا دەشێ هەردوو کەرت لە یەکدی دوور بخرێنەوە وەک کە بڵێی «لێمەوە دیارە، پێیانەوە ماندوە» کەرتەکان لە یەکدی دوور دەنووسیت. هۆیەکەش ئەوەیە کە لێرەدا فیعلی ئاشکرا پەیدا نییە، پێشگرەکان کەوتوونەتە بەرایی تاقمی ناو و دەوری حەرفی جەڕ دەبینن.

2- ئەگەر لەمپەڕەکە پێشگرێکی دیکە بوو یەکەمیان بە جودا لە نزیکەوە دەنووسرێ ئەوەکەی دیکەش بە پێی دەستووری گشتی بە فیعلەکەوە دەلکێت وەک پێهەڵگرتن، لێدەرهاویشتن، تێهەڵقوتان.

پێشگری لێکدراو هەمیشە دەبێ لە دوورەوە بە جودا بنووسرێ وەک «لێکرا هاتن، تێک هەڵقژان، پێکەوە ڕۆیشتن، پێکیانەوە هەڵکرد...». حوکمی پێشگری لێکدراو وەک هی وشەی سەربەخۆیە تەنانەت وا دەبێ لە جێگەی وشەی سەربەخۆ بەکار دەهێنرێ وەک کە دەڵێ «جەژنت پیرۆز بێ» ئەوی دیکەش دەڵێ «پێکمانەوە...».

3- ئەگەر لەمپەڕەکە یەکێک لە نیشانەکان بوو.

یەکالا کردنی ئەم گرفتە پێوەندی بەهێزی بە ڕیزمانی کوردی و بە فیلۆلۆجی کوردییەوە هەیە. کاتی خۆشی کە لە ئەنجومەنی کۆڕ ئەم باسە هاتە ناوەوە زمانناسەکانی کۆڕ بە وردی و بە هەناسەی درێژەوە لێکۆڵینەوەیان تێدا کرد. بەش بە حاڵی خۆم ئەوسا و ئێستاکەش بە دوای تیشکێکی ناوەکی زمانەکەمانەوە بووم لە پێشنیاز کردنی بیروڕای گرفت ڕەوێنەوەدا.

ورد بوونەوە لە سروشتی ئەو نیشانانە جوداوازیەکی بنجی ڕەچاو دەکا لە نێوان ئەوان و پێشگردا هەرچی پێشگرە وشەیەکی سەربەخۆی واتا ناتەواوە لە لاوە بۆ بەرایی فیعل دێت و تێکەڵ بە تەکوینی دەبێ، تەنانەت پێشگر هەیە واتاشی هەیە وەک «بەر، دەر...» هەرچی نیشانەکانن بە شێوەیەکی بنجیتر لە پێکهێنانی فیعلەکە بەشدارن تا ئەوەی دەشی بگوترێ بەشێکی بنەڕەتین لە فیعلەکەدا بە تایبەتی نیشانەی «مضارعة» و نیشانەی ئەمر. ئەگەر سەلیقەی هەستی فیتری لە دەستنیشان کردنی پلەی نزیکی ئەو نیشانانە لە فیعلەوە بەکاربهێنین دەتوانین بڵێین بەم جۆرەی خوارەوە ڕیز دەبن:

1) پلەی یەکەمی نزیکی لە فیعلەکە هی نیشانەی «مضارعة»یە، وەک دەچێ، دەکا، هەڵدەستێ، دەنووسین.

2) پلەی دوەم هی نیشانەی ئەمرە وەک، بگرن، بڕۆ، بنووسین...

3) پلەی سێیەم هی نەهیە وەک، مەبێژە، مەنووسن، نەکەین.

4) پلەی چوارەم هی نەفیە وەک ناشێوێن، نەبزوتن.

لە نیشانەی مضارعە و ئەمردا هەرچی هەبوونی سەربەخۆ هەیە نادیارە. تا ڕادەیەک نیشانەی نەفی لە زیهندا بە سەربەخۆیی جلوەیەک دەبەستێ بە تایبەتی کە دەچێتە سەر غەیری فیعل و وشەی نوێ پەیدا دەکات وەک ناشیرن، ناپوختە، نەمێرد، لە مەتەڵی فۆلکلۆریدا هەیە دەڵێ، چوومە سەر نەگڵ نەبەردەکی، بانگم کردە نەژن نە مێردەکی، گوتم ئەو نەگا نەکەرەی دەرکە لەو نەگەنم نەجۆیە...

لە کوردیدا فیعلی ڕابردوو بنەمای فیعلەکانی دیکەیە چونکە بەلادانی نونی چاوگ پەیدا دەبێ و هیچی زیادی پیوە نییە. لە ئینگلیزیدا ڕێژەی مضارع بنەمایە و ڕابردووی لێ وەردەگیرێ بە پێچەوانەی کوردی کە مضارع لە ڕابردووەوە وەردەگیرێ. ئەمریش لە مضارعەوە دێت چونکە ئەگەر نەزانیت ڕێژەی مضارعی فیعل چییە نازانی ئەمرەکەی چییە بەڵگەش لەوەدا ڕێژەی ئەمری «مؤول» دەترازێ وەک، دەخۆیت، بخۆیت، بخۆ — دێیت، بێیت، وەرە - دەکوژیت، بکوژیت، بکوژە... ئەم باسەی هاتنی فیعل لە فیعلەوە درێژەی زۆرە بە ناچاری وازی لێ دەهێنم.

ئەمریش پێش نەهی دێت چونکە نەهی ڕێ لە ئەمر دەبڕێتەوە، تەنانەت دەستووری فیقهی و قانوونیش سەلماندویەتی کە حەرام بوون بەسەر حەڵاڵ بووندا دێت. وەک دیاریشە نەفی دەکەوێتە بەرانبەر ڕابردوو و مضارع نەهیش دەکەوێتە بەرانبەر ئەمر، لەوەوە من بۆ ئەوە دەچم کە نیشانەی مضارعە هەر تەنها ڕاگەیەنی کات نییە بەڵکوو ئیجابییەتیش لە فیعلەکەدا پێک دەهێنێت بۆیە لەگەڵ نیشانەی نەفیدا کۆ نابێتەوە. ئەگەر تەنها ڕاگەیەنی کات بوایە و ڕوودانەکە لە تەنها وشەی فیعلەکەوە بوایە نیشانەی

مضارعە لەگەڵ نەفیدا کۆ دەبۆوە. دیارە نیشانەی ئەمریش، کە داخوازییە، لەگەڵ نەهی، کە نەهێشتنە، کۆ نابنەوە. بۆیە ناگوترێ، «نادەڕۆم، نادەکەیت» ناشگوترێ «مەبڕۆ، نەبکەین...».

لەم وردەکارییە دەگەم بە پێشنیازی چۆنیەتی نووسینی ئەو فیعلەی کە لەمپەڕی نیشانە دەکەوێتە بەینی خۆی و پێشگریەوە، هەروەها چۆنیەتی نووسینی ئەو نیشانانە کە لەمپەڕ دەکەوێتە نێوان خۆیان و فیعلەکەیانەوە.

وەهام بە بیردا دێ، کاتی خۆی پێشنیازی کۆڕ فەرقی کرد لە نێوان ئەوەی نیشانەکە خۆی ببێتە لەمپەڕ لەگەڵ ئەوەی لەمپەڕ بکەوێتە نێوان فیعل و نیشانەکە. کە نیشانەکە لەمپەڕ بوو پێشگرەکە بە جودا بنووسرێ و نیشانەکەش بە دەقی خۆی لەگەڵ فیعلەکە بمێنێتەوە وەک هەڵبگرە، دەرمەپەڕە، تێناکەوێ، لێنەپرسێتەوە، تێنەگەیشت. کە لەمپەڕیش کەوتە نێوان نیشانە و فیعلەکە تێکڕایان بەیەکەوە بلکێن وەک دەمدوێنێ، ناتداتێ، نەیگرتیت، بیانبینە، بیانبینێت، مەیانشکێنەوە، دەتخوێند، بتکردبایە، نەتکردبایە. کە نیشانەش قرتا پێشگر بە فیعلەوە بلکێ وەک هەڵگرە، تێکە، پێکەنە...

ڕای من ئەوە بوو، ئێستاش هەروەهایە، کە ئێمە زانیمان ئەو نیشانانە وەک بەشێکی فیعلەکانن پێویستە لە هیچ باریکدا لەیەکدی جودا نەبنەوە وەک هەڵدەستێ، تێناگا، لێبکاتەوە، وەرمەگێڕە، دەرنەچین، هەڵنەچوو. بەڵام کە پێشگرەکە لێکدراو بوو ناشێ بە نیشانە و فیعلەکەوە بلکێت چونکە گوتمان وەک وشەی عادەتی سەربەخۆی لێهاتوە وەک تێکڕا نەهاتن، پێکەوە بڕۆن، تێک ناگەن، لێکەوە دێن... بەلای منەوە ئەمە بڕیاری مەنتیقە بەڵام بەرهەڵستیم نییە لەوەدا بە ناوی سووک کردنی ڕێنووس و کەم کردنەوەی دەستوورەکانی بڕیار بدرێ هەر لەمپەڕێکی بێتە دوای پێشگرەوە لە فیعلەکەی جودا بکاتەوە، ئەگەر دەستووری لەمەشیان سوکتر پەیدا بێ بەویشیان ڕازیم.

حاڵەتێک هەیە دوو نیشانەی تێدا کۆدەبێتەوە ئەویش ڕابردووی بەردەوامە لە حاڵەتی نەفیدا. دەگوترێ نەدەهات. لێرەدا «دە»ی مضارعە بۆتە ماڵی ڕابردوو، هەرچی ڕابردووشە پێویستی نییە بەهۆی نیشانە ئیسپاتی پەیدا بوونی خۆی بکات چونکە ڕووداوی ڕابردوو، بە اصطلاح «أمر واقع»ە، لە حاڵەتی ڕوونەدان وەیا خۆزی خواستن ڕابردوو پەکی لەسەر نیشانە دەکەوێ وەک نەهات، کاشکی بچوومایە... بۆیە ئەم «دە»یەی «مضارعە» لە ڕابردووی بەردەوامدا لایەنی ئەو ئیجابیەت و ئیسپاتەی کە لە مضارعدا دەیبینێ پەکی کەوتووە و هیچ سەیر نییە لەگەڵ نەفیدا بێت. ڕێژەی فیعلی ڕابردوو لە کوردی سەروو و خوارووددا جارێکی دیکەش لایەنی «امر واقع» بوونی خۆی لەوە دەردەخات کە بۆ نەفی نیشانەی «نەهی» مضارع بەکار دێنێت هەروەک لە نەهیدا جەزم و بڕیە هەیە لە ڕابردووشدا دڵنیایی و یەقینی ڕوودان و ڕوونەدان هەیە چونکە ڕوودان و ڕوونەدانی شتی لەمەوبەر لە ڕووناکیدایە وەک ئاییندە نییە لە گومانی بوون و نەبووندا بێت. تۆ کە گوتت «دوێنێ هاتم» لەوانەیت لە صەدی صەد ڕاستت کردبێ، مەگەر مەبەستت هەڵفریواندن بێ، بەڵام کە دەڵێی «دوای سەعاتێک دێم» لەوانەیە هەر پێت نەکرێ بێیت چونکە مەعلوم نییە دوای یەک چرکەی سەعات چی دەقەومێ. وا دەزانم ئەمەیە هۆی بەکارهێنانی نیشانەی زێدە بەهێزی «نە» لە ڕابردوودا. سەیری چۆن «نەخۆش» لە «ناخۆش» بەهێزترە وەیا کە دەڵێی ئەم ماینە «نەزۆکە» دڵنیایت لەوەی هەرگیز نازێ وەک ئەوەی کە گوتت «نەزا» دڵنیایت لە نەزانەکە بەڵام کە گوتت «نازێ» ڕەنگە بە هەڵەدا چووبیت چونکە لەوانەیە بزێ. گوێگری بەڕێز بمبوورێ لەم درێژە پێدانەی لایەنی لێکۆڵینەوەی سەر بە فیلۆلۆجی کە دێم هەندێکی وەختە بەنرخەکەی دەکەمە قوربانی تۆزە تروسکەیەک بۆ ڕووناک کردنەوەی ڕێزمانە بەنرخترەکەی بایی ئەوەی لێکدانەوە و توێژینەوەی شەخسی یارمەتی دابێتم.

وشەیەکی دیکەی نەفی هەیە بە ڕواڵەت «نە»یە عادەتیەکەی نەهی و نەفیە کەچی لە ڕاستیدا نیشانە نییە بەڵکوو ئامرازی عەتفە و نەفی تێدایە عەتفەکەشی لەوەوە دیارە کە وشە وەیا ڕستە بەیەکەوە دەبەستێتەوە وەک «نە دارا نە دلێر هیچ کامیان ناخوێنن»، «نە دێم نە دەڕۆم»، «نە بکەی نە بخۆی تەماشای سای گەردەنی بکەی» — فۆلکلۆر. هەر چونکە بۆ نەفی نییە لەگەڵ نیشانەی ئەمر و مضارعدا کۆبۆوە. بە وردبوونەوەش دەردەکەوێ ئەم «نە»یە وەکوو «لم، لما»ی عەرەبی، لە مەعنادا، کاری مضارع دەکاتە ڕابردوو چونکە کە دەڵێی «کابرا نە دەخوا نە دەخواتەوە» باسی حاڵەتێکی وەها دەکەیت کە لێرە بە پێشەوە مەعلوم بووە، تەنانەت ئەگەر مەبەست لە ئێستا بە دواوەش بێ بەهۆی یەقینێک کە لە ڕابردوودا بۆت پەیدا بووە بە دڵنیاییەوە نەفیەکە دەکەیت. ئەم «نە»یە لە جێی nor و neither ی ئینگلیزییە کە شێوەی نەفی or ی و either ن. «نە»ی کوردی شێوەی نەفی «یان»ە وەک کە دەڵێی «یان دێت یان دەچێت» کە لەوێشدا دڵنیایی هەیە، ئەگەر نەبێ دەڵێی «دەشێ، ڕەنگە، ڕێی تێدەچێ، مومکینە بێت و نەیەت». ئەم «نە»یە وەک وشەی سەربەخۆ بە جودا و دوور لە وشەی دیکە دەنووسرێ.

پێشگر حیسابی دیکەشی هەیە

1- پێشگر هەیە دەشێ لە ڕستەدا ناوی زەرف بێت و دەشێ پێشگری ئاساییش بێت وەک «دەر، بەر». بە نموونە کە گوتت «نیوەم بەرکەوت، مەلەکەم بەردا...» لە مانەدا «بەر» پێشگرە چونکە ناشێ ڕستەکان هەڵوەشێنەوە و «بەر» ڕاگوێزرێت بۆ شوێنێکی دیکە و بارێکی دیکە لە ڕستەی تازە هەڵنراودا واتە ناتوانی بڵێی «بەری مەلەکەم دا، بەر نیوەم

کەوت» بەڵام کە گوتت «لە ڕێگەکە بەر کەوت» لێرەدا «بەر» زەرفە نەک پێشگر بۆیە دەکرێ بڵێی «کەوتە بەر ڕێگە».

2- هەندێ وشەی «ناوی زەرف» هەن وەک «سەر، ژێر، پێش، پاش...» خەریکن بەرەو پێشگری دەڕۆن و وشەی فەرهەنگی تازە دروست دەکەن وەک «سەرکەوتن، ژێرکەوتن، پێشکەوتن، پاشکەوتن» لەگەڵ ناودا وەک «پاشدز، پێشدەستی، ژوورخان، ژێرزەمین».

پێشگربوونی ئەم وشانە لەو تەرزە لێکدرانەدا بەوە مەعلوم دەبێ کە ئەگەر وشە لێکدراوەکانت لەبەریەک هەڵوەشاندن واتاکەی دەدۆڕێنێت بە نموونە کە گوتت «چومە ژێری زەمینەکە» تۆ نەچویتە «ژێرزەمین» وەیا کە گوتت «کەوتمە سەر دارەکە» تۆ «سەرنەکەوتیت»...

3- وشە هەیە ناوی گشتییە بەڵام شێوەی پێشگری وەرگرتووە. لە هەموان گونجاوتر وشەی «سەربڕین» ـە کە بە تەواوی جێی «کوشتنەوە»ی گرتۆتەوە وەک کە دەڵێی «بەرخەکەم سەربڕی». تۆ کە گوتت «سەری بەرخەکەم بڕی» نەت کوشتۆتەوە ڕەنگە نەختێکت بریندار کردبێ. وشەی «دەستبڕین» بە واتای فێڵ لێ کردن هێندەی «سەربڕین» نەبۆتە وشەی فەرهەنگی چونکە دەشێ لە ڕستەدا هەڵوەشێتەوە وەک کە دەڵێی «دەستی کابرای بڕی» دەشتوانی بڵێی «کابرای دەست بڕی».

4- وشەی «پێکردن» بە واتای داگیرساندن لە بنەڕەتدا «بە ئاگر کردن» ـە، تا ئێستاش دەگوترێ «چراکە بە ئاگر کە» بەڵام پێشگرەکە لەگەڵ فیعلەکەدا وەها جۆش خواردوو بووە دەتوانی بڵێی «چراکە بە ئاگر پێکە نەک بە کفریت». بە زۆریش «پێکردن» بە کار دێت نەک «بە ئاگر کردن».

پێشگرەکانی «پێ، تێ، لێ» لە پریپۆزیشنەوە هاتوون. «پێ» لە پریپۆزیشنی «بە»وە هاتوە، بە نموونە دەڵێی «بە دارام گوت» کە ناوی دارات لادا دەڵێی

«پێم گوت»، «بە هەموانم ڕاگەیاند — پێیانم ڕاگەیاند». «لێ» گۆڕاوی «لە»یە وەک کە دەڵێی «لە کێشەکە دوام — لێی دوام، ڕەخنەم لە تۆ گرت — ڕەخنەم لێگرتی»...

وا بزانم «تێ» دوو سەرچاوەی هەیە، یەکێکیان هەمان «لە» یە کە گوتم «لێ»ی لێکەوتۆتەوە. دەڵێی «تفەنگم لە نیشانە گرت — تفەنگم تێگرت، ئاردم لە جەواڵ کرد — ئاردم تێکرد». ئەوی دیکەیان وشەی «توێ — تێو»ە کە لە بنەڕەتدا یەک شتن. لە فارسیدا وشەی «تو» باوە وەک کە دەڵێ «تودلت» واتە «ناوی دڵت، تێوی دڵت». لە ناوچەی دامەنی بیتوێن و بەری مەرگە و بنگرد گوێم لێبوە دەڵێن «دەچێتە تێویەوە - بە واتای دەچێتە ناویەوە». ئەم پێشگرەی «تێ» کە لە «تێو، توێ» وە هات نابێتە «لە» وەک کە گوتت «وەها تێماوم پەشۆکاوم — بە چاکی تێوەستاوە جووڵەی بۆ ناکرێ» هیچ هەڵوەشاندنەوەیەک نایانباتەوە بۆ «لە». ئەگەر «تێدامان، تێداوەستان» بێت دەچێتەوە بۆ «لە». ڕەنگە بەشێکی زۆری ئەو وشانەی بە پێشگری «تێ» دەست پێ دەکەن «تێ»کەیان یەکسەر لە «تێو، توێ»وە هاتبێت بەڵام لە هەڵوەشانەوەدا بشێ واتاکەی بە پریپۆزیشنی «لە» لێ بدرێتەوە چونکە «لە»ش زەرفیەتی تێدایە وەک «تێو، تێ». بە نموونە دەشێ «تێکردن» بە «لە ئەودا کردن» تەفسیر بکرێ. زۆریش ئاشکرایە پێشگری «تێ» کە لەگەڵ فیعلێکدا پێکەوە زەرفییەت پەیدا دەکەن مومکینە بە دەستەواژەی «لەناو» بگۆڕدرێتەوە وەک «تێهاویشتن — لەناو هاویشتن»، تێکردن — لەناوکردن، تێوەردان — لەناو وەردان» بەڵام «نیشانە تێگرتن» نابێتە «نیشانە لەناو گرتن» چونکە لە «تێگرتن»دا زەرفییەت نییە، نموونەی ئەمەش زۆرە وەک کە گوتت «تێبوون، تێوەرپێچان، تێبەستن» ناکرێنە «لەناو بوون، لەناو وەرپێچان، لەناو بەستن...».

بە هەمەحاڵ ئەم وردبوونەوەیەش پتر لەگەڵ فیلۆلۆجی خزمە، لابەلایی دەگاتەوە ڕێنووس بەڵام بێگومان هەموو وردبوونەوەیەک پرشنگ بۆ

دەوروبەری خۆی دەهاوێژێ. هەر ئەم تەرزە وردەکارییەش بوو کاتی خۆی لیژنەی زمان و زانستەکانی گەیاندە ئەو ڕاستییە کە تەنها سێ پێشگری «تێ، لێ، پێ» دەست دەدەن لە بەرایی پێشگری دیکەوە بێن و ببن بە دوو پێشگری یەک فیعل هۆیەکەش دەگەڕێتەوە بۆ سیفەتی پریپۆزیشن لە هەرسێکیاندا. پێشگری «پێ» پێش «لێ، تێ» دەکەوێتەوە وەک «پێلێکردنەوە، پێتێکردن). پێشگری «لێ»ش پێش «پێ، تێ» دەکەوێتەوە وەک «لێپێکەوتن، لێتێگەیشتن». هەرچی پێشگری «تێ»یە ناتوانێ پێش «پێ، لێ» بکەوێتەوە. هیچ کامێکیش لە پێشگرە عادەتیەکانی وەک «هەڵ، دا، وەر» نایەنە پێش پێشگری دیکەوە.

پێشگرە پریپۆزیشنەکانی «پێ، لێ، تێ» کێشەی دیکەشیان هەیە، دەگوترێ پێوەبوون- لێوەبوون، پێداهاتن- پێ داهاتن، پێڕاهاتن- پێ ڕاهاتن». بە ڕواڵەت پێشگرەکان هەریەکە دوو شێوە نووسینی هەیە، جارێکیان دوویان پێکەوە دەنووسرێن جارێکیشیان لێک دەترازێن. ئەم ڕواڵەتە ساغ کردنەوەی دەوێ.

کە دەڵێی «پێدا چوون، تێدا ژیان» لەمانەدا پێشگرەکەی «دا» نییە هاتۆتە دوای «پێ، تێ» بەڵکوو تەواوکەری پریپۆزیشنی «بە، لە»یە هاتۆتە دوایانەوە «بە هەولێردا تێپەڕین — پێدا تێپەڕین» «لە هەولێردا ژیان — تێدا ژیان».

هەروەهاش تەواوکەرەکانی «ڕا، وە» کە بە ڕواڵەت لەگەڵ پێشگری «ڕا، وە» یەک شتن لە حوکمدا زۆر جودان. کە دەڵێی «تێڕا ڕۆیشتن — لێوە نۆڕین» دوو تەواوکەری پریپوزیشنت بەکار هێناوە کە دەبێ بە پێشگرەکانەوە بلکێن و هەردوویان بە جودا دوور لە فیعلەکەوە بنووسرێن، بەڵام کە گوتت «تێڕامان، لێوەکردن» بە دوا پێشگری «تێ، لێ»دا دوو پێشگری «ڕا، وە»ت بەکارهێناوە کە دەبێ بە پێی دەستووری لێرە بە پێشەوە باسکراو «تێ، لێ» بە جودا و لە نزیک پێشگرەکەی دیکە و فیعلەکەوە بنووسرێن. لێرەدا

پێشگری «(وە» لە وشەی «وەکردن» پاشگرە مەشوورەکەی «ەوە - هاتنەوە، کردنەوە...»یە لەم لەهجەیەدا بۆ بەرایی وشە هاتوە. کەواتە ئەم «وە»یە ئەگەر تەواوکەری پریپۆزیشن بوو بە پریپۆزیشنەکەوە دەلکێت، ئەگەر پێشگریش بوو لە نزیک فیعلەکەوە دەنووسرێت — نالێم پێوەی دەلکێت چونکە لە نووسیندا هەڵناگرێ بە دوا خۆیەوە بلکێ.

زۆربەی نووسەران و زمانناسان، ئەگەر نەڵێم هەموویان، وا دەزانن «ڕا»ی فیعلی «ڕاکردن» پێشگرە مەشورەکەی «ڕاهاتن، ڕاگوێستن» ـە بەڵام ڕاستییەکەی لە «ڕاکردن»دا ئەم «ڕا»یە کورت کراوەی وشەی «هەڕا»یە بە واتای «غاردان». بەڵگەی ئەمەش کەم نییە

1) تا ئێستاش «هەڕاکردن» لە ئاخاوتندا باوە.

2) لەگەڵ hurry ئینگلیزی خزمە هەم لە واتادا و هەم لە شێوەدا. وا دەزانم وشەی «خێرا»ی کوردیش هەر هەمان «هەڕا»ی کوردی و hurry ئینگلیزی بێت، وەک دەزانین گۆڕانی دەنگی «خ» بە «ه» وەیا «ه» بە «خ» لە کوریدا ڕەچاو دەکرێ وەک کە وشەی «خۆر، هۆر» یەک شتن، وشەی «هەر»ی کوردی و «خەر»ی فارسیش یەک شتن.

3) بە عادەت پێشگر فیعلی تێپەڕ ناکاتە تێنەپەڕ فیعلی تێنەپەڕیش ناکاتە تێپەڕ کەچی «ڕا کردن» بە واتای غاردانە و تێنەپەڕە «کردن»یش تێپەڕە.

4) بابەتی مەتەڵی فۆلکلۆری هەیە دەڵێ «قوندەکە قوندەکە لە سەربانان هەڕا کە بۆقە و پێت ناڵێم...». دیارە «هەڕا کردن» لە کۆن و نوێدا باو بووە. کەواتە دەبێ ئەم «ڕا»یە لە وشەی «ڕاکردن»دا لە دوری فیعلەکەوە وەک وشەیەکی سەربەخۆ بنووسرێت.

وشە هەن لەو پێشگرە پریپۆزیشنانە داکەوتون وەک «لێزان، لێهاتوو، پێخەف، تێچێن» لە کۆنەوە باو بوون هی نوێشیان چۆتە سەر وەک «پێنووس، پێناس» دەبێ هەردوو کەرتیان بەیەکەوە بلکێن. تەواوکەری ئەو تەرزە پێشگرانەش وەک «پێدا، تێڕا، لێوە» هەموویان لەیەک حوکمدان دەبێ بە پێشگرەکانیانەوە بلکێن. زوربەی نووسەران تەواوکەری «دا» دەلکێنن و نالکێنن ئەوانی دیکە هەمیشە دەلکێنن. ئەم مامڵەت جوداییە بێجێییە و بەسەر هیچ بنجێکەوە هەڵناوەستێ. دەبێ هەموویان بلکێن وەک

- لە ڕاستیدا
- لە کەرکوکڕا
- بە سەروماڵەوە

لێدا، تێدا، پێدا، پێڕا، تێڕا، پێوە، لێوە، تێکڕا، تێکدا، لێکەوە، پێکەوە، لێکترەوە، پێکترەوە... وشەیەک هەبوو تا بیست ساڵێک لەمەوبەر، بە تایبەتی لە نێوان مەلایاند، باو بوو هەر دەڵێی لە بیران چۆتەوە ئەویش وشەی «لەوڕا»یە بە واتای «چونکە». ڕەنگە وشەکە کورت کراوەی «لە ئەوڕا» بێ. ئەگەر ژیایەوە دەبێ ئەویش بەسەر یەکەوە بنووسرێ. ئێستا باسی چۆنیەتی وشەی وەک «بەپارە، بێدین، لەبار» بە دوا ئەوانیشدا «بۆچوون، بۆهاتن» دەکەین کە هەموویان پریپۆزیشنیان لە پێشەوەیە.

ئەم وشانە وەک «جلدروو، دڵسۆز...» نین کە کەرتی دوەمیان بە تەنهایی واتا نابەخشێ، لەبەر ئەمە ناشێ یەکسەر دەستووری ئەوانیان بۆ ڕاگوێزین.

بەلای منەوە نووسینی ئەم وشانە کە هەردوو کەرتیان یەک واتای سەرانسەر ببەخشن دەبێ هەردوو کەرتیان لەیەکدی نزیک بنووسرێن و ئەگەر پیتەکانیان دەست بدەن بەیەکەوە بلکێن. وەک دیارە ئەم وشانە ئەگەر لە

غەیری فیعلەوە هەڵستن ئاوەڵناو پێک دێنن و پلەی خوارو و ژووریان دەبێ وەک «بەدینتر، هەرەلەبار، بێحاڵترین» ئنجا کە ئەمە وەها بێ دیارە لەم شێوە بەکارهێنانەیەدا لە ڕادەی تاکە وشەی واتاداران کە دەبێ هەموو پیتەکانی بەیەکەوە بلکێن. بەڵام کە لە ڕستەدا وشەکە هەڵوەشایەوە بەیەکەوە لکانەکەش کۆتایی دێت وەک کە بڵێی «ئەم دنیایە بێ دین ڕاناوەستێ — ناتوانم بێ پارە خانوو بکەم — لە بارێکی دیکەدا جۆرێکی دیکە دەدوێم». ئەم ڕاستییە هۆیەک بوو لەوانەی کاتی خۆی لە ئەنجوومەنی کۆڕ پێشنیازم دەکرد کە وشەی وەک «جلدروو، دڵسۆز...» هەمیشە بەیەکەوە بلکێن چونکە هەڵوەشاندنەوە هەڵناگرن.

وشەی «بۆچوون، بۆهاتن» و هی وەک ئەوان کە پریپۆزیشن هاتۆتە بەرایی چاوگیانەوە ڕێ دەدا نەختێک لە سروشتی ئەم «بۆ»یە بکۆڵینەوە. بە دوا ئەودا برا چوکەڵەیەکیشی هەیە کە دەبێ باس بکرێ. هاتنی پریپۆزیشن لە بەرایی چاوگ و تێکڕای بەرەی ناودا شتێکی ئاساییە وەک «بۆ فرۆشتن، دار دەکرم، بە خوێندن سەر دەکەوێت، لە زانینەوە دەدوێ...» بەڵام لە نێوان پریپۆزیشنەکاندا تەنها «بۆ» بە ڕاشکاوی دەتوانێ بێتە بەرایی ڕاناوی لکاوەوە وەک «بۆت بە پەرۆشم، بۆیان دەنێرم، بۆم دەنووسی...» لەمەشدا ڕەفتاری «پێ، لێ، تێ» دەکات کە ئەوانیش لە پریپۆزیشنەوە بوونەتە پێشگر.

پریپۆزیشنی عادەتی دەچێتە بەرایی هەموو ئەو وشانەی کە لە تاقمی ناون وەک ئاوەڵناو و ڕاناوی کەسی نەلکاو و ناوی ئیشاری و ژمارە و دەستەواژەش بەڵام هەرگیز ناچێتە بەرایی ڕاناوی لکاوەوە، «بۆ»ش بە بێ واسیتە ناچێتە بەرایی فیعلەوە دەڵێی «هەڵفڕی، داکەوت، لێکەوت، بەربوو» بەڵام ناتوانی بڵێی «بۆ هات، بۆ ڕۆیشت» مەگەر ڕاناوێکی لکاو ببێتە جەمسەری بەیەکەوە گەییشتنی «بۆ» و فیعلەکە وەک «بۆمان هات، بۆیان ڕەخسا...». لەمەوە دەردەکەوێ پریپۆزیشنی «بۆ» نابێتە پێشگری تەواو. سەرنج دەری دەخات ئەم «بۆ»یە لە هەموو ڕوویێکەوە ڕەفتاری «برای»ی فارسی دەکات کە

ئەویش دەچێتە پێش ڕاناوی لکاوەوە نەک فیعل، لە واتاشدا یەکجار نزیکی «بۆ»یە. لەمەش زیاتر، هەروەک «بۆ» دەتوانێ پریپۆزیشنی «لە» بە خۆیەوە بگرێ «برای»ی فارسیش پریپۆزیشنی «از» بە خۆیەوە دەگرێ کە بە واتای «لە»یە. دەڵێی «لە بۆ» فارسیش دەڵێن «از برای». شێوە ئاخاوتنی کوردی هەیە لەجیاتی «لە بۆ» دەڵێ «ئەڕا» کە ئەویش دەچێتە پێش ڕاناوی لکاوەوە.

بە هەمەحاڵ ئاسان نییە بڕیار بدرێ لەسەر ئەوەی ئایا وشەی «بۆ» لە چییەوە هاتوە و بنەمای چی بووە. ئەو نزیکییەی لە نێوان «از برای» و «ئەڕا»دا هەیە لە ڕووی شێوەوە لە نێوان «لە بۆ» و هیچ کامێکیاندا نییە. ساغ کردنەوەی پرسیارەکە تێهەڵکشانی بەرەو مێژووی کۆنی زمانی کوردی گەرەکە، بە تایبەتی لە ڕووی بەراورد کردنی وشەکە لەگەڵ ئەو وشانەی شکڵی کۆنیان پارێزراوە و لەو نزیکن. هەرچۆنێک بێ پێویستە لە نووسیندا وشەی وەک «بۆچوون، بۆهاتن» هەردوو کەرتەکەی بەسەر یەکەوە بن نەک «بۆ» یەکە دوور بخرێتەوە. وەک دیاریشە «بۆ» لە کۆنەوە لەگەڵ چاوگدا وشەی نوێی دروست کردوە، ئەویش بە دەگمەن. نەبیستراوە لێرە بە پێشەوە «بۆ» لەگەڵ وشەی غەیری چاوگدا هاتبێ. لەبەر ئەمە وا دەزانم وشەی «بۆناو» بە واتای «ڕاناو – ضمیر» کە بەو دواییە داتاشراوە لە ڕاستە دەستووری وشەسازی کوردی لا داوە، خۆ وشەی «ڕاناو» بە هیچ جۆرێک لە هیچ دەستوورێکدا ڕەوا نییە چونکە کەرتی «ڕا» ئەگەر پێشگرە ناسراوەکەی «ڕاهاتن، ڕاگوێستن، ڕادان...» بێت هەرگیز ناشێ لەگەڵ ناودا بێت، ئەگەر کورت کراوەی «ئەڕا»ش بێ پێویستە بگوترێ «ئەڕای ناو» «ڕای ناو» بە تەواوی وەک «از برای نام، برای نام». ئەوەی ئاشکرایە «بۆناو» و «ڕاناو» لە وشەی Pronoun ەوە وەرگێڕدراونەتە سەر کوردی. لە «پرۆناون»دا کەرتی «پرو – Pro» بە واتای «بەرەو»ی کوردی دێت، دیارە noun ەکەش بە واتای ناوی کوردییە. بەو پێیە تەرجەمەی وشەکە بۆ

کوردی دەبێ بیکاتە «بەرەو ناو» هەتا بشلّێی لە وشەی Pronoun ەوە نزیکە.

برا چکۆلەکەی «بۆ» پریپۆزیشنی «بێ»یە کە ئەویش لە هەندێ باردا دەشێ ڕاناوی لکاو بە خۆیەوە بگرێ وەک کە دەگوترێ «بێت ناژیم – بێمان هەڵناکەن...» وەک بزانم لە پەراوێزێکی زێدە تەسکدا و لە تەنها حاڵەتی نەفیدا ئەم «بێ»یە هەندێ ڕاناوی لکاو بە دوا خۆیدا دەهێنێ. ئەمە لە لاییێکەوە، لە لایەکی دیشەوە «بێ» وەکوو «بۆ» دەتوانێ پریپۆزیشن بخاتە پێش خۆیەوە وەک «بە بێ پارە سەفەر ناکرێ، بە بێ ترس هاتە دوان...». سەرەڕای ئەمە دەتوانێ پریپۆزیشن بە دوا خۆشیدا بهێنێ وەک «بێ لەم جارە دوو جاری دیکەش هاتووم». بۆیەش دەڵێم «بێ» پریپۆزیشنەکان بە پێش و پاشی خۆی دەیەخێت

1) دەتوانرێ «بە» فڕێ بدرێت و لە جیاتی «بە بێ پارە» بگوترێ «بێ پارە».

2) ئەو ڕستەیەی کە تێیدا لەگەڵ «لە» کۆدەبێتەوە بەر حوکمی «بێ»یە هەرچی «لە»یە یاریدەدەری تەواوکردنی واتای «بێ»کەیە. بە نموونە سەرنج بدە ئەم دوو ڕستەیە «بێ تۆ دارا هات – بێ لە تۆ داراش هات»...

لە لایەن چۆنیەتی نووسینیانەوە دەبێ هەردوو پریپۆزیشن بە جودا و لەیەکدی دوور بنووسرێن نەکا خەیاڵ بۆ ئەوە بچێ کە ئەمانە پریپۆزیشنی لێکدراون. دیارە کە ڕاناوی لکاویشیان بە دوادا هات دەبێ پێیانەوە بلکێ هەرچەند مەعلومیشە «بۆ» ڕێ نادا شتی لە دواوە پێوە بلکێ، ئنجا لەگەڵ ڕاناوەکەدا دوور لە وشەی دوای خۆیانەوە بنووسرێن.

زۆر جاران نووسەر و ئاخێوەری کوردی وا دەزانێ وشەی وەک «پێ لێهەڵبڕین، پێ لێخستن، پێ لێنان، پێ شێل کردن...» بە پێشگری «پێ» دەست پێ دەکەن، کەچی ئەم «پێ»یە بە واتای «قدم»ی عەرەبییە و ناوێکی عادەتییە. لەبەر ئەمە دەبێ نووسەر ئاگاداری واتای وشەکە بێت و لەو شوێنەدا کە پێشگر نییە بە جودا دوور لە وشەی دواتری بنووسێت.

ڕاستییەکەی هەر سێ پێشگری «پێ، لێ، تێ» لە بەکارهێناندا وا دەبێ پێشگری تەواون واش دەبێ وێنە پێشگرن. عەیارەی لەیەکدی جوداکردنەوەشیان ئەوەیە ئەگەر گۆڕانیان بەسەر واتای وشەدا هێنا پێشگری تەواو و ڕاستینەن دەنا وێنە پێشگرن. بە نموونە، وشەی «پێکردن» ئەگەر بە واتای «داگیرساندن» بوو کەرتی «پێ»ی پێشگرە چونکە واتای فیعلی «کردن»ی گۆڕیوە، بەڵام کە گوتت «کارەکەم بە تۆبزی پی کرد» لێرەدا «پێ»کە پێشگری تەواو نییە چونکە واتای «کردن»ی نەگۆڕیوە.
«لێکردن» کە بە واتای دوشمنایەتی بوو «لێ»یەکە پێشگرە بەڵام کە گوتت «فیڵم لێ کرد» «لێ»کە وێنە پێشگرە. لە وشەی «تێبردن»دا «تێ» پێشگرە بەڵام لە «تێبەستن»دا وێنە پێشگرە. لەگەڵ ئەمەشدا زۆر زەحمەتە نووسەری عادەتی، بە تایبەتی هی بێگانە، بتوانێ هەست بەم جوداوازییەی هەردوو حاڵەتی وشەکان بکات. لەبەر ئەمە وەها بەرژەوەند دەبینم کە لەگەڵ هەمواندا و لە هەموو بارێکدا یەک جۆرە مامڵەت بکرێ و هەمان دەستووریان بەسەردا بهێندرێ.

لێرە کە قسە لە پێشگر دەکەین باسی گیروگرفتی هەندێ شێوە داڕشتنی دەستەواژە بکەین کە لەگەڵ فیعل و غەیری فیعلیشدا دێن. دەستەواژەی وەک «چنگ‌لەسەرشان، دەستەونەزەر، بەرەوڕۆژ، دەستەوخەنجەر، دمەوڕوو...» کە دەشێ ئاوەڵناو وەیا ئاوەڵکار بن، بەرەو ئەوە ڕۆیشتوون ببنە وشەی فەرهەنگی و فەرقیان هەیە لەگەڵ دەستەواژەی وەک «قەرز نەدانەوە، لەسەر چەقی ڕێگا ڕاوەستان، لە ئاودا مەلە کردن»... بەڵێ ڕاستە هێندەی

وشەی وەک «بنبەردەقیلە، پەپوولەسلێمانکە، حاجیلەکلەک، دورەشێر...» دەق گرتوو و جۆش خواردوو نەبوون بەڵام چونکە بوونەتە ئاوەڵناو و ئاوەڵکار و هەڵوەشاندنەوەش قبووڵ ناکەن لێیان دێت کەرتە جوداکانیان لەیەکدی نزیک بنووسرێن بێ ئەوەی بلکێندرێن. کە دەڵێم هەڵوەشاندنەوە قبووڵ ناکەن مەبەستم ئەوەیە کە ئەگەر هەڵتوەشاندن واتاکەیان وەک خۆی نامێنێ، بە نموونە کە گوتت «دوو چەنگی خستە سەرشانەکانی برادەرەکەی» دەستەواژەی «چنگلەسەرشان» تێچو بەڵام کە «لەسەر چەقی ڕێگە ڕاوەستان» خرایە ڕستە و بوو بە «لەسەر چەقی دووڕۆژان بە تەنها بۆی ڕاوەستام» واتاکەی وەک خۆی دەمێنێتەوە، کەواتە جۆش خواردوو نەبووە و نەچۆتە ڕیزی وشەی فەرهەنگییەوە. لەبەر ئەمە پێویست نییە بەڵکوو جایەز نییە کەرتەکانی «لەسەر چەقی ڕێگە ڕاوەستان – بە پێوە نان خواردن»... لەیەکدی نزیک بخرێنەوە.

لە بانگەوازەکەدا وشەی «سادە و داڕێژراو» بەر خاڵی دوەم کەوتوون گۆیا خزمی یەکترن، دواتر لە خاڵی سێیەمدا «وشەی نادە» هاتوە. لە خاڵی شەشەمدا وشەی لێکدراو هاتوە. ڕەنگە بێ سوود نەبێ بزانین سادە و نادە و داڕێژراو و لێکدراو چین.

بە پێی سەرجوملەی لێکدانەوەکانی لیژنەی زمان و زانستەکانی سەر بە کۆڕی زانیاری کورد، کە من لەوانەی وا ئێستا وەریان دەگرم ڕازیم، وشە لە ڕووی کەرتە پێکهێنەرەکانیەوە دەبێتە دوو بەش:

1) سادە

2) نادە، نادەش دەبێتەوە

- داڕێژراو

- لێکدراو

1) سادە ئەو وشەیەیە کە لە شێوەی ئێستاکەیدا هیچ زیادیەکی لاوەکی تێدا نەبێت، وەک پیاو، بەرد، ڕێوی، هیزە.

2) ناسادە ئەو وشەیەیە کە زیادی لەگەڵدا بێت.

- داڕێژراو ئەو ناسادەیەیە کە تەنها یەک وشەی واتاداری تەواوی تێدا بێ، واتە زیادیەکەی واتای سەربەخۆی نەبێ وەک هونەرمەند، پیاوەتی، پیاوانە، دەرگەوان.

- لێکدراو ئەو ناسادەیەیە کە بەلای کەمەوە دوو وشەی واتاداری تەواوی تێدا بێ وەک بەردەنوێژ، داروەکاز، شەونم.

دەشێ بڵێین پلەی هەرە تێکەڵ و بیندرێژی وشەی لێکدراوی کوردی «ئاوێتە»یە وەک وشەی «سیسارکەکەچەڵ، بنبەردەقیلە، چاردەڕێیان»... بەڵام هەر دەکاتەوە لێکدراو چونکە درێژبوونەوەی وشەی لێکدراو ئەگەر چۆنایەتیەکی تازە پەیدا نەکا نایباتە بارێکی تازەوە.

کاتی خۆی لیژنەی زمان و زانستەکانی کە تێیدا ئەندام بووم، بایەخی وشەی واتاداری دا بەو کەرتەی کە «ناوی کارای لێکدراو - اسم فاعل مرکب» و «ناوی بەرکاری لێکدراو - اسم مفعول مرکب» دروست دەکا وەک کەرتی «خۆر» لە «نانخۆر» و کەرتی «دەر» لە «ناندەر» و کەرتی «شۆر» لە «جلکشۆر». بایەخەکەش لە گرنگی دەوری ئەو کەرتە لە پێکهێنانی وشەکانەوە دێت، نەخۆ ئەو کەرتانە بە تەنها واتا نابەخشن. بۆیە بوو لیژنە وشەی وەک لێنەر، تێکەر، بەرخۆر، ڕاڕەو... ی بە وشەی داڕێژراو دانا چونکە ئەگەر کەرتە فیعلییەکەی بە واتادار دانەنابایە وشەکان پێیان نەدەگوترا

داڕێژراو. سەیر لەوەدایە ئەو وشانە سادەش نین چونکە تاکە وشە نین، دەمێنیتەوە سەر ئەوەی پێیان بگوترێ «ناسادە» بەڵام ناسادەیەک کە وا نە داڕێژراوە و نە لێکدراویشە. وشەی وەک تێکەڵ، پێکەڵپێک بە ڕواڵەت وشەی واتاداری تێدا نییە بەڵام ڕاستییەکەی لەمانەدا بە ئەسڵ وشەی «یەک» هەیە کە ژمارەی واتادارە و لێی سواوە. لەبەر ئەمە داڕێژراوی بێ تەئویلن.

لە تێکڕای ئەم بۆچوونانەوە دەبێ وشەی وەک «هەڵتەکین، ڕایەخ، پێخەف، دابڕ، وەرگێڕ» و هەرچی دیکەی ئەوتۆیی هەبێ بە داڕێژراو دابندرێ، دیارە وشەی وەک «بەهەڵەبەر، گوڵەپێغەمبەرانە...» سەرەڕای لیکدراو ئاوێتەشن.

ئەم وشانەی داڕێژراو، لێکدراو، ئاوێتەش، بە کورتی هەموو ناسادەکان مادەم بوونبێتنە وشەی فەرهەنگی دەبێ بەسەریەکەوە بنووسرێن. هەر لەم بڕیارەوە دەفامرێتەوە کە هەرچی پاشگر هەیە دەبێ بە پێش خۆیەوە بلکێ. نیشانەی «پێناسین» و «کۆ» هەرچەند پاشگر نین چونکە گۆڕان بەسەر واتای وشەدا ناهێنن دیسانەوە هەر بە کۆتایی وشەوە دەلکێن وەک «دڵەکە، لە دڵاندا». کە بەیەکیشەوە هاتن هەر دەلکێن وەک «دڵەکان».

پاشگرەکانی کار ئەمانەن

1) دەنگی «ا» وەک «ترس – ترسا، ترش – ترشا، کول – کولایەوە» بەلای منەوە دەنگی «ی» کە دێتە پاش هەندێ وشەوە و دەیکاتە فیعل، پاشگر نییە، چونکە هەر لە ڕابردوودا دەردەکەوێ لە مضارعدا ون دەبێ. بە نموونە وشەی «لەرز» دەبێتە «لەرزی، لەرزیم...» بەڵام لە مضارعدا یێیەکە دەرناکەوێ «دەلەرزم، دەلەرزن...» هەرچی ئەلفەکەیە لە مضارعدا دەبێتە «ی»ی کراوە وەک «ترسام – دەترسێم، جۆشا – دەجۆشێت، کۆشاین – دەکۆشێین». لەگەڵ ئەمەشدا «ی» لەرزی،

دزی، دڕی، و هەموو فیعلێکی دیکە، وەک بەدیهیە، بە کۆتایی وشەوە دەلکێ، هەر نەبێ لەبەر ئەوەی کە بەشێکی پێکهێنەری فیعلەکەیە.

2) پاشگری «کا» وەک ئالۆزکا، هەڵتروشکا، بزرِکا... لە مضارعیشدا دەبێتە «کێ»... دەئالۆزکێ، دەبزرِکێ...

3) پاشگری «را»ی فیعلی کارابزر وەک دیترا، گوشرا، نووسرا. لە مضارعیشدا دەبێتە «رێ». دەگوشرێ، دەدیترێ.

4) پاشگری «اند» وەک ترساندی، پساندی. لە مضارعیشدا دەبێتە «ێن»... دەپسێنم، دەترسێنن، دەرِمێنن...

5) پاشگری «ەوە» وەیا «وە» کە لە ڕابردوو و ئایندەدا یەک شتە وەک چوومەوە - دەچمەوە، پرسیتەوە - دەپرسیتەوە. ئەم پاشگرە وەک لە نموونەکاندا دیارە، دەکەوێتە دوای ڕاناوی کۆتایی فیعلەکەشەوە، واشدەبێ بە دوا دوو ڕاناودا دێت وەک دیتمتەوە، ناسیانینەوە... پاشگرەکانی دیکە یەکسەر بە کۆتایی فیعلەکەوە دەلکێن و ڕاناویان بە دوادا دێن.

پاشگری غەیری کار هێندە زۆرە لە ئەژمار نایەت. وەک لێرە بە پێشەوە گوتم سەرلەبەری پاشگرەکان بە کۆتایی وشەوە دەلکێن، زوربەی نووسەرانیش هەروەهایان دەنووسن.

وشەی وەک «دڵپاک» ئەگەر لە واتادا کەرتەکانی بەیەکەوە بەسترابوونەوە بەسەریەکەوە بنووسرێن بەڵام نەلکێن. دەڵێن «دارا دڵپاکە» بەڵام کە لە واتادا لەیەکدی ترازان دەبێ دوور لەیەکدی بنووسرێن وەک چی هەتە لە ناو دڵ پاکە.

وشەی وەک «دەستنوێژ» چونکە بۆتە فەرهەنگی دەبێ کەرتەکانی بەیەکەوە بلکێن. «پێپلکە، پێکوڕە، سەراسنە، گەرماژۆ»... و هەرچی وشەی لێکدراوی وەها هەیە دەبێ کەرتەکانیان بلکێن.

وشەکانی «هەرچی، هەرکام، هەرکوێ» بوونەتە وشەی لێکدراو کەرتەکانیان ئەگەر لکانیان هەڵگرتبا دەبوایە بلکێن. بەڵام «هەر» بە دوا خۆیەوە نالکێ بۆیە دەبێ بەسەریەکەوە بنووسرێن. بەڵام «هەر کەسێک هەر شارێک» چونکە نەبوونەتە وشەی لێکدراو دەبێ لەیەکدی دوور بنووسرێن.

نیشانەکانی پلەی بەراورد و باڵای «صفە» بێ دەمەتەقە دەبێ بە وشەوە بلکێن وەک «جوانتر، جوانترین، هەرەجوان». بەڵام وشەی «هەر» لە ڕستەی وەک «هەر دەڕۆم و نایگەمێ — هەر منم ئیستە وارسی عیسا — هەر مرۆڤ دەتوانێ بدوێ» دەبێ سەربەخۆ و لە دووری وشەی دوایەوە بنووسرێ. لە وشەی «شتی تر»دا ئەم «تر»ە سیفەتە و بە وشەوە نالکێ.

یەکەم، دووەم، بیستەم، دوازدەمین، پێنجەمین... نیشانەی پلەیان بە ژمارەکەیانەوە دەلکێ و لەمەدا چ گرفت نییە، بەڵام چ پێویست بەوە ناکات لە هەندێ ژمارەدا دەنگی «هە» لە لاوە بێت بۆ ناو وشەکە وەک کە هەندێ کەس دەنووسن «دووهەم، سێهەم» چونکە ئەم «هە»یە ناچێتە کۆتایی هەموو ژمارەکانەوە تەنانەت کە نووسیشت «دوازدەهەم» ناتوانی بنووسیت وەیا بڵێیت «دوازدەهەمین». بەشی زۆری ئاخێوەری کوردیش دۆستی ئەم «ە»یە نین ئیتر بۆ دەبێ بەسەر زمانی ئەدەبیدا بسەپێت؟

وشەی «هی» کە ئامرازی وەسف و ئیزافەیە بە جودا دەبێ بنووسرێ وەک «ئەمە هی منە... هی قەڵەو بگرە هی لەڕ نا». بەڵام کە سوانی بەسەردا هات و مایەوە «ی» دەبێ بە کۆتایی وشەوە بلکێت وەک «گوڵی جوان، بەرخی بارام».

دوو وشە هەن لە نێوان عەشرەتە مەیلەو کوێستانییەکانی بەشێکی سۆراندا باون تا بڵێی گەش و ڕاگەیەنن، بریتین لە چەند کەرتی ئەوتۆ هیچیان بە تەنها واتا نابەخشن. دوو وشەکە «پیٚهەڵا» و «پێدا»یە وەک کە یەکێک بڵێ «جۆگەوجۆگە ڕۆیشتم» ئەوی دیکەش بپرسێ «پیٚهەڵا یان پێدا؟» واتە بەرەو سەرچاوە و بناوانەوە وەیا بەرەو قوناو؟ جوانی وشەکانیش لەوەوە دێت کە دەست دەدەن بۆ هەرچی سەرەژوور و سەرەژێرە، هەر لە شاخی ڕژد و ڕکەوە هەتا دەگاتە پێدەشتی دەستەوناو و هەموار. وشەی یەکەمیان بریتییە لە «پێ هەڵ دا» ئەوی دیکەش «پێ دا»ی عادەتی. بەلای منەوە یەکەمیان دەبێ «پێ»کەی بە جودا لە نزیکی «هەڵدا»ی بەیەکەوە لکاوەوە بنووسرێت، «پێدا»ش بەیەکەوە بلکێت «پیٚهەڵا – پێدا».

## بەشی 3: وشەی ناسادە

لە ژێر ئەم خاڵەدا دوو بەندی

- دیاردەی داتاشین و قووت دانی هەندێ دەنگ.
- گیروگرفتی ژمارەکان لە «11»وە تا «19» نووسراوە.

لە بارەی دیاردەی داتاشین و قووت دانی هەندێ دەنگەوە:

ئەگەر ڕوون کرابایەوە ئایا مەبەست لە داتاشین ئەوەیە کە لە عەرەبیدا پێی دەگوترێ «نحت» یاخود مەبەست دارشتنە باس لێکراوەکەیە دەتوانرا بە جۆرێکی ڕوونتر لە کێشەکە بکۆڵرێتەوە. بەهەمەحاڵ داتاشین بە واتای «نحت» بێ وەیا بە واتای دارشتن و «اشتقاق» بێ لە ڕێنووسدا فەرق پەیدا ناکا چونکە هەر وشەیەکی فەرهەنگی لە دارشتنەوە وەیا لە داتاشینەوە وەیا لە غەیری ئەوانەوە بەرهەم بێت مامڵەتی تاکە وشەی لەگەڵدا دەکرێ بە پێی تێبینی و هەلومەرجێکی کە لە بەشی زۆریان دواین.

یەک تێبینی هەیە پێویستە باسی بکەم. وشەی داتاشراو و دارێژراو و لێکدراوی لێرە بە پێشەوە شوێنی خۆیان لە زماندا کردۆتەوە و بوونەتە بەشێکی ئاخاوتن و نووسین. دەمێنێتەوە وشەی تازە دروستکراو و چۆنیەتی پێشوازی لێکردنی. بێگومان ڕێگەبەستن لە داهێنانی وشەی نوێ نەزۆک کردنی زمانەکەیە چونکە ئەم جیهانە وەها خێرا بەرەوپێشەوە دەڕوات و دەگۆڕێت خەریکە بڵێم زمانی پار ناتوانێ بە چاکی تەعبیر لە هەموو دۆزراوە و داهێنراو و خەیاڵلێکراو و نەخشەکیشراوی ئەمساڵ بداتەوە. دانانی وشەی نوێش لە چەند ڕێگەیەکەوە دەبێ. یەکیان ئەوەیە خەڵق لە خۆوە ناوێک بۆ

شتێکی تازە بابەت دابنێ. دووەمیان ئەوەیە نووسەر و زمانزان هەر یەکە لە مەیدانی خۆیدا بە دوا وشە و تەعبیری نوێدا بگەڕێ.

بە داخەوە وەها دەبێ کام وشەی چرووکە ئەویان پەرە دەستێنێ وەک «ڕاناو» ە پشت لە دەستوورە، بەبرەوە، بێکەڵکەکە وەیا وشەی «بەروار» کە لە هەڵەیەکی ڕووتەوە بۆ ناو فەرهەنگانیش ڕۆیشت.

وا بە چاک دەزانم لیژنەیەکی لێزانان ئەم کارە بگرنە ئەستۆی خۆیانەوە و دەستەی کوردیش سەرپەرشتی چالاکی و بەرهەمی لیژنەکە بکات و هەر جارەش کە لیستەی وشەی نوێ یەکجارەکی وەردەگرن و قەراردادە دەکرێن ئەوەی ڕاستیش بێ دەستەی کوردی بۆ ئەم جۆرە کارە پەیدا بووە ئەگەرنا چی چاکتری لە توانادایە؟ لە ئیمکاندا نییە بۆ هەر تاقمە وشەیەکی نوێ کۆڕێکی وەک ئەمەیان ڕێک بخات، بۆیەیە دەبێ لیژنە بخاتە کارەوە. ئەم کۆڕەیش دەبێ لیژنەی لێزانی بێ تەرەفانی بەدوادا بێت بۆ هەڵبژاردنی پێشنیازە پەسەندەکان.

بگەڕێینەوە بۆ ڕێچکەی لێکۆڵینەوەکان

- قوت دانی دەنگ
- ئەم دیاردەیە لە ڕوانگەی ڕوونەوە سەیری دەکرێ

ئێمە هەرچەند نەشتوانین وشەی ئێستاکەی کوردی ببەینەوە بۆ سەرچاوەی مێژوویی کۆنی زمانی کوردی تا بزانین لە ماوەی چوار هەزار ساڵدا چ گۆڕانێکی بەسەردا هاتووە ئەوەندەمان پێ دەکرێ لە ڕێی بەراورد کردنی وشەی لەهجە جوداکانەوە بزانین کامیان پتر لێی سواوە وەیا بەرەو هەڵە بۆتەوە. بە نموونە ئەو وشە کوردییەی کە بە واتای «دشنام»ی فارسی و «شتم»ی عەرەبییە لە هەندێ ناوچەدا «دژنێو»ی بۆ بەکاردەهێنن. دیارە

ئەم دژنێوە بۆتە «جنێو» کە وشەیەکی زیندوو و دەستووریشە چونکە سوانی بەسەردا هاتووە نەک شێوان. «جنێو» بۆتە «جوێن» و جوێنیش گۆراوە بە «جوون». ئەم دوو وشەیەی «جوێن» و «جوون» هەردوویان بیژۆک و ڕیزپەڕن تەنها بۆ ئاخاوتن دەست دەدەن «دژنێو» و «جنێو» هەردوویان پەسەند و دەستوورین بەر شێوەی زمانی ئەدەبی دەکەون. ئێمە ئەگەر «دژنێو» و «جنێو» - مان بۆ نەپاراسترابایە نەماندەزانی «جوێن» بیژۆکە، بێ «جوێن»یش بیژۆک بوونی «جوون»مان بۆ دەرنەدەکەوت. هەر لەم ڕێگایەوە دەتوانین وشان بە یەکدی بگرین و ڕاستتر و لە ڕاست نزیکەکان هەڵبژێرین.

جگە لەم بەراورد کردنە دەتوانین لە ڕێی دەستوورە بەرچاوەکانی سوان و قرتان لە هەر لەهجەیەکدا ماکە ڕاستینەکە بدۆزینەوە، وەک بڵێی لەهجەیەک بە شایەد دەگرین لە خۆی.

هەروەها دەشێ لە ڕێی دەستوورەکانی فۆنەتیکەوە بگەین بە حەقیقەتی گەلێک لەو وشانەی سوان و گۆڕانیان بەسەردا هاتووە.

ڕێ هەیە ناوناوە ئەو زمانانەی لە کوردییەوە نزیکن بکەین بە عەیارەی هەڵاواردنی وشەیەک بەسەر وشەیەکی دیکەی کوردیدا.

بێگومان ڕێگەی دیکەش هەن بۆ دەستنیشانکردنی وشەی پەسەند، پێویست نییە لێرەدا بە دوایان بکەوین.

لە نموونەی بەراورد کردنی لەهجە لەگەڵ لەهجەدا دەتوانین وشەی «گێ» بە وشەی «گوێ» بگرین. دیارە وشەکە بە لێسوان بۆتە «گێ» نەک بە لێ زیاد کردن بۆتە «گوێ» چونکە بە عادەت وشە لێی دەسوێ مەگەر بە بەڵگە ئیسپات بکرێ کە بەسەریەوە نراوە. لێرەدا بەڵگەی بەراورد کردن ئیسپاتی لێسوانەکە دەکات چونکە ئەم واوەی وشەی «گوێ» لە شێوە

ئاخاوتنی کرمانجی سەروو و لە وشەی «گوش»ی فارسیشدا هەر هەیە. کە بێین و وشەی «خێ» بەراورد بکەین لەگەڵ «خوێ» دەتوانین قیاسەکەی «گێ» و «گوێ»ی لێ بەکاربهێنین، بڵێین مادام لەوێدا واوەکە بنیچەییە دەبێ لێرەشدا ئەم واوە بنیچەیی بێ، جگە لەوەی کە لە لەهجەی دیکەی کوردیدا وشەی «خوا» لە جێگەی «خوێ» باوە و پاڵپشتی لە ڕەسەنایەتی ئەو واوە دەکات.

لە نموونەی بەشایەد گرتنی دەستووری سوان و لێقرتانی دەنگ لە تاکە لەهجەدا دەتوانین تێبردن وەیا سووک دەربڕین وەیا گۆڕینی دەنگی دال لە لەهجەی سلێمانی بکەین بە عەیارەی ساغ کردنەوەی وشە، هەروەهاش گۆڕینی لامی قەڵەو بە ڕێی لاواز لە کۆیە و خۆشناوەتی و ڕەواندز و باڵەک و گەردییاتی و دزەییاتی بکەین بەو عەیارەیە.

لە نموونەی بە دەنگ هێنانی دەستوورەکانی فۆنەتیک دەتوانین وشەی وەک دەزگا، دەزگرە، پژدەر بکەین بە عەیارە. دەزگا و دەزگرە لە دەستگا، دەستگرەوە هاتوون. لە پێشەوە دەنگەکەی «ت» لە هەردوو وشەدا قرتاوە، کە دەزانین قرتانی «ت» لە زۆر باردا دیاردەیەکی فۆنەتیکی کوردییە، کە تێیەکە نەما دەنگی «س»ی کپ بە وەستاوی دەکەوێتە پێش دەنگی «گ»ی ئاوازەدار. بە پێی خزمایەتی نێوان دەنگەکان ئاوازەدار حەز لە ئاوازەدار دەکات کپیش حەز لە کپ دەکات، بە زۆریش کپ خۆ دەگۆڕێ بۆ ئاوازەدار، ئیتر سینەکە دەبێتە زێ.

وشەی پژدەریش لە هەمان ڕێگەوە لە «پشتدەر»ەوە بە قرتانی تێیەکە و گۆڕانی شینی کپ بە ژێی ئاوازەدار بۆتە «پژدەر». ئا لێرەدا دەبێ بڵێم دەنگی «س» خزمی «ز»ە هەرچەند لە نووسینیشدا بەرەو «ش» بردراوە، دەنگی «ش»یش خزمی «ژ»ە. ڕەنگە بەشی هەرە زۆری خوێنەری کورد وا بزانێ ئەو پیتانەی لە ئەلفوبێی عەرەبیدا شکڵیان لەیەکدی دەچێ لە دەنگیشدا خزم

بن کەچی ڕاستییەکەی ئەوەیە کە «س، ش، ف، ک، ت» شێوەی کپی دەنگە ئاوازەدارەکانی «ز، ژ، ڤ، گ، د»ن. بەڵام دەبێ بڵێم خزمایەتی «ت» لەگەڵ هەردوو دەنگی «ط، د»دا جێی ساغ کردنەوەیە.

بەکارهێنانی ئەم تەرزە دەستوورانە بۆ دۆزینەوەی وشەی ڕاست نابێ لە پەراوێزی شێوە ئاخاوتنی ئێستاکەی کوردیمانەوە ڕاگوێزێ بۆ ئەو دەقە مێژویی و کۆنانەی کە لە هەندێ نووسینی کۆنینەی زمانە ئێرانیەکاندا پارێزراوە. ڕەنگە بەشی زۆری ئەو وشانەی کە لە زوربەی لەهجەکاندا سوانیان بەسەردا هاتووە شێوەی دروستیان لە لەهجەیێکدا مابێت کە بشێ نارەسەنایەتی وەیا نادروستی وەیا هەڵەیی وشەی لەهجەکانی دیکەی پێ ئیسپات بکرێ. کاتێک کە هیچ عەیارەی تەرجیح لە لەهجەکانی ئێستاکەماندا چنگ نەکەوت دەشێ بگەڕێینەوە بۆ ئەو دەقە کۆنانە - ئەگەر هەبن - جا ئەگەر ئێمە ئەم پێوانەیەمان کرد بە عەیارەی تەرجیح و هەڵاواردن بێ ئەوەی لایەنگیری بکەین، بە ئاسانی، دەتوانین دەسبژاری وشەی دروست و نادروست لە لەهجەکانماندا بکەین بێ ئەوەی دەست لە شێوەی ئاخاوتن بدەین. ئێمە کە هاتین و نووسیمان «ئەفەندی، دڵ، کردن» لێ دەگەڕێین خەڵقی سلێمانی بڵێن «ئەفەنگی» و کۆییش بڵێن «در» بادینیش «کرن».

ئنجا با بزانین چۆن دەتوانین ئەم دەسبژارە بکەین. بەلای باوەڕی منەوە کارەکە بەندە بە دوو مەرجی سەرەتاییەوە: یەکەمیان، دەسبژارەکە خۆی. دووەمیان سەپاندنی وشە دەسبژارەکان بەسەر زمانی ئەدەبیماندا.

لە ڕووی دەسبژارەکەوە، پێویستە لیژنەیەکی لێزانی نیگافرەوانی دڵسۆزی بێلایەن کارەکە بگرێتە ئەستۆی خۆیەوە و لە ماوەیەکدا چی بە ڕاست دەزانێ ئەوە پەسەند بکات و لە شێوەی پێشنیازدا بڵاوی بکاتەوە بۆ ئەوەی ئەگەر کەس ڕەخنە و تێبینی و نارەزایی هەبوو لە ماوەیەکی دیارکراودا بە لیژنەکەی ڕابگەیەنێتەوە وەیا لە لای خۆیەوە لە هەمان ماوەدا بڵاوی بکاتەوە تاکوو لە

ڕادەی ئیمکاندا چی هەرە پەسەندە ئەویان ببێتە وشەی ئەدەبی قەرارداده. واشدەزانم سەرلەبەری کارەکە لە ماوەی شەش مانگدا بە ئەنجام دەگات.

لە ڕووی بەکارهێنانی وشە دەسبژارکراوەکانەوە پێویستە دوا بڕیار و پەسەند کردنی لیژنەکە ببێتە دەستوور و هەرچی دەزگای نووسین و بڵاوکردنەوە و چاپەمەنی هەیە پێرەوی بکات. بێگومان سەلماندنی گشتی لە خۆوە پەیدا نابێ. بە داخەوە بە درێژایی ڕۆژگار یەک هۆی تەفرەقە چوار هۆی یەکبوونی بەزاندوە، تەنانەت لە زەمینەی «فقه» و قانونیشدا ئەوەی پێی دەڵێن «مانع» بەهێزترە لە «مقتضی». جا ئەگەر دەسەڵاتی ڕەسمی پشتگیری لە لیژنە و بڕیارەکانی نەکات تەنها ئەوانە بە دوایدا دێن کە لەگەڵیدا هاوباوەڕن، ئەوساش نووسینی ئەدەبی کوردی ئەو هەرِەمەیە دەبێ کە هەیە. هەڵبەت ئەو لیژنەیە کە پێک بێت لە جغزی دەستەی کوردی کۆڕی عێراق پیک دێت، دەسەڵاتەکەش هی دەستەی کوردی و کۆڕی عێراقی دەبێت. سەپاندن و بەسەردا بڕینیش لەم کارەدا نابێتە دیکتاتۆرایەتی چونکە هەموو یاسا و دەستوورێکی ئەم جیهانە لەلایەن کەسانی دەسەڵات پێدراوەوە قەرارداده دەکرێن و دەسەڵاتی ڕەسمیش بەسەر هەموانیدا دەبڕێ. لە بانگەوازەکەدا کە ئیشارەت بۆ تێبرِ نەکردنی بڕیار و پێشنیازەکانی کۆڕی زانیاری کورد دەکات ئەم لایەنەی بوون و نەبوونی دەسەڵاتی لەبیر چووە، فەرامۆشیشی کردوە کە پێشنیاز و ڕێنووس و بڕیاری هیچ کەس و هیچ لایەنێک نەیتوانیوە خۆی بسەپێنێ نەک هەر هی کۆڕ ئەگەر نا بانگەوازەکە چ لزومی هەبوو؟ ئەم کۆبوونەوەیە بۆچی؟

ئنجا کە ئەمە پێشنیازی من بێ بە زاهیر چی لێرەدا دەیڵێم لە بارەی قوت دان و سوان و گۆڕانی دەنگ وەیا سەرلەبەری کێشەی ڕێنووسی کوردییەوە دەبێتە کارێکی بێلزوم بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەندە بۆ نووسینەکەی من دەمێنێتەوە کە لە دوارِۆژدا لیژنەکە سەیری بکات و بە تێبینی و ڕەخنەی دابنێ.

فەرمانی زیندوو کردنەوە و نەکردنەوەی دەنگی قرتاو بەوەدا سووک و ئاسان دەبێ کە هەموومان سەلماندومانە شێوە ئاخاوتنی سلێمانی بنەمای نووسینی ئەدەبیمان بێت چونکە ئەم سەلماندنە ئەرکی ساغ کردنەوەی سوان و قرتانی لەهجەکانی دیکە بەلاوە دەنێ و تەنها ڕەوڕەوی ئەو سوانە دەبێ کە لە ڕاوێژ و دەمودوی ئاخێوەری سلێمانیدا پەیدا بووە. ئێمە کە بەراوردی وشەی ئاخاوتنی سلێمانی لەگەڵ وشەی شێوەیەکی دیکەی کوردیدا بکەین لەو حاڵەدا دەبێ کە وشەکەی دیکە پەسەندتر وەیا ڕەسەنتر وەیا ڕاستتر بێ نەک لە ڕووی ئەو قرتان و سوانەی کە بەسەریدا هاتووە. من نایەم «ئەبێم»ی خۆشناوەتی ببەمەوە سەر «ئەبێژم» و قرتانی دەنگی «ژ»ی تێدا دەرخەم چونکە بەتەما نیم شێوە ئاخاوتنی خۆشناو بکەمە بنەمای نووسینی ئەدەبیمان هەروەها لەبەر هەمان بنۆس «ئۆڵڵاهی» مەنگوڕانیش نابەمەوە سەر «وەڵڵاهی». لەمەش زیاتر دەسپارێزی دەکەم کە نایەم لێک بدەمەوە ئایا «ئاوزەنگییان» دەدا لە «ئاوی زیندەگی» یا «ئاوی زیندەگانی»یەوە هاتووە چونکە دەبێ شێوەی ئەم وشەیە بە پێی بەکارهێنانی سلێمانی بخرێتە نووسینی ئەدەبیمانەوە، مەگەر ئاشکرا بێ کە وشەکەی سلێمانی شێواوتر و لێ قرتاوتر و بەرەو هەڵەتر بێ لە وشەی هاوتای خۆی لە لەهجەیەکی دیکەدا. ئێمە کە تەنها لە حاڵەتی هەبوونی وشە وەیا تەعبیری پەسەندتر لە هی سلێمانی هانا ببینە بەر لەهجەیەکی دیکەی کوردی دەست لێدانێکی ڕەوامان کردووە، بەولای ڕەواوە پێویستیشە، بەولای پێویستەوە کاری دەستخاوێنی و دڵسۆزییە بۆ زمانی کوردی، ئنجا پەراوێزی دەست لێدانەکەش تا بڵێی تەسکە لە چاو جغزە بەرفرەوانەکەی سەرلەبەری شێوەی ئاخاوتنی سلێمانی، خۆ ئەگەر وەها نەڵێین و نەیسەلمێنین دیسان لە سەرەتاوە لزوم بەم تەرزە کۆڕە نامینێ. بە نموونە دەڵێم کە فرەنسییەکان هەڵەیەکیان لە لەهجەی پارسدا دۆزیەوە وا چاکە پاریسیەکان واز لە هەڵەکە بهێنن نەک هەموو میللەتی فرەنسە و دەیان ملیۆن ئاخێوەری فرەنسەیی فێری ئەو هەڵەیە بکرێن.

ئەوەی لە لەهجەی سلێمانیدا بۆتە دەقێکی زێدە بەرچاوی ئاخاوتن مامڵەت کردنە لەگەڵ هەندێ دەنگ کە لە پێش هەموویانەوە دەنگی «د» دێت بە دوا ئەویشدا «ت»، ئنجا دراوسێ بوونی دەنگی «ن، گ» و «ن، د».
هەروەک میسرییەکان قاف و جیم دەگۆڕن بە هەمزە و گاف، وەیا پارسیەکان دەنگی ڕێ دەگۆڕن بە غەین هەروەهاش سلێمانیەتی بە زۆری دەنگی دال تێ دەبەن وەیا کلۆری دەکەن، تا ڕادەیەک ئەو مامڵەتە لەگەڵ دەنگی «ت»شدا دەکەن.

لە لایەن دیاردەی کلۆر کردنەوە وەک کە دەڵێ «ئەحمەد ئەمەت بۆچی کرد» ناشی هیچ گرفت و دەمەتەقە پەیدا ببێ چونکە نووسەری سلێمانیش پیتی دەنگەکان دەنووسێت بەڵام لە خوێندنەوەدا کلۆریان دەکات. دەمێنێتەوە بگوترێ ئایا دەشێ داوا لە هەموو کورد بکرێ ئەو دال و تێیە کلۆر بکات؟ بێگومان تەکلیفی وەها جێی بیستن نییە چ جایی سەلماندن، نەک هەر لەبەر ئەوەی کە گۆڕین وەیا تێبردنی دەنگەکان کۆشەشێکی بەرەو هەڵەیە، بەڵکوو لەبەر هۆیەکی گرنگی دیکەی قسەبڕەوە، ئاخێوەری دەرەوەی سلێمانی ناتوانێ دەنگەکان بە کلۆر کراوی دەرببڕێت چونکە زۆر زەحمەتە بۆ ئەوەی زمانی بەو کلۆر کردنە نەپژابێ وەیا ماوەیەکی درێژ لە سلێمانی ڕاینەبواردبێ فێری بێت وەیا بزانێ کەی و لە کوێ کلۆریان بکات.

لە لایەن قرتاندنی دەنگەکان و گۆڕینیانەوە، لە خۆم دەپرسم ئایا دەبێ وشەی وەک «بەغداد، قەرەداغ، گوێدرێژ، دێت» چۆن بنووسرێ؟ ئایا وەک دەربڕینی خەڵقی سلێمانی بنووسرێ «بەغا، قەراخ، گوێرێژ، تەت»؟ یاخود وەک کە زوربەی هەرە هەرە زۆری ئاخیوەری کورد نزیک لە حەقیقەت دەریاندەبڕێ؟ وشەی «مطبخ»ی عەرەبی بنووسرێ «موبەق» وەیا «مەتبەخ»؟ وا بزانم وەک بەدیهیە ئاشکرایە کە دەبێ وشەکان بەو شکڵە بنووسرێن کە لە ڕاستی نزیکترن و لە فەرهەنگدا تۆمار دەکرێن. زۆریەنی کورد دەڵێن «بەغدا» کە نزیکترە لە «بەغداد» هەروەهاش «قەرەداغ»

وشه دروستەکەیە نە «قەراغ». لە بارەی وشەی وەک «گوێریێژ»ەوە، ئەگەر بمانەوێ ئەم وشەیە بێ دال بنووسرێ دەبێ بگەڕێینەوە سەر فەرهەنگ و هەموو ئەو وشانەی کە دالی «دریێژ»یان پاراستووە دالەکەیان لێ بقرتێنین هەر بۆ خاتری «گوێریێژ» بە ڕاست بگەڕێ، ئنجا هەموو ئاخێوەری کوردیش کە دەڵێ «گوێدریێژ» بگێڕینەوە لە نووسینی وشە ڕاستەکە. وشەی «یەت» کە ئایندە وەیا ئێستاکەی «هات»ە دەبوو بەو شێوەی سلێمانیش «ئەهێت، ئەیەت» بێ. وشەی «موبەق» کە بە سوان و بە گۆڕان «ت»ەکەی بووە بە «و» ڕێ خۆش دەکات بۆ سەپاندنی «دەس» لە جێگەی «دەست» و سەپاندنی «حەوهەزار» لە جێگەی «حەفت وەیا حەوت هەزار».

بە هەمەحاڵ ڕێدان بە پەسەند کردنی قرتان و شێوە گۆڕان لەو وشانەدا کە زوربەی ئاخێوەری کورد قرتان و گۆڕانیان تێدا نەکردوە دەبێتە هۆی دوو شێواندنی زێدە گەورە. یەکەمیان، شێوانی زمانەکە دوەمیشیان شێوانی ئاخێوەری کورد کە هەر خۆی دەبێتەوە نووسەر. لەوە هەر بگەڕێ کە بێگانە سەرەدەری لەو قرتان و گۆڕانە ناکا. ئەم تەرزە قرتان و گۆڕانە کە بەسەر زمانی ئەدەبیماندا سەپا دوو ئەرکی نوێزاد دەخاتە سەر شانی ئاخێوەر و نووسەر و خوێنەری بادینی، جارێکیان کە دێت بۆ بەرژەوەندی زمانی یەکگرتوو واز لە نووسینی هەموو لەهجەی خۆی دەهێنێت، جاری دیکەشیان کە ناچار دەبێ لەبەر خاتری سوان و گۆڕانی ناوچەیی واز لە ڕاستە زمانەکەی زوربەی ئاخێوەری کورد بهێنێت.

کورتەی باوەڕی من کە پتر لەوەی خۆی خۆش بوێ بەرژەوەندی زمانی یەکگرتوومانی خۆش دەوێ ئەوەیە سوان و قرتان و گۆران لەو وشانەدا دەسەلمێندرێ کە زوربەی ئاخێوەری کوردی لەسەری ڕۆیشتبێت.

هەر لەناو توێژی باسی قرتانی دەنگدا ڕووبەڕووی جۆرێک قرتان دەبین کە لە ڕێزمانەوە بەرەو ڕێنووس دێتەوە ئەویش قرتانی «ب»ی ڕێژەی فەرمانی فیعلە لە هەندێ حاڵەت و هەندێ فیعلدا.

وەک دەزانین ڕێژەی فەرمان لەو فیعلانەدا کە پێشگریان پێوەیە وەیا بوونەتە فیعلی لێکدراو دەشێ نیشانەی «ب»ی فەرمانیان بڕوات و دەشێ بشمێنێتەوە وەک، هەڵببڕە - هەڵبڕە، هەڵبگرە - هەڵگرە، تێبکۆشە - تێکۆشە، سەرببڕە - سەربڕە، بە ئاگربکە - بە ئاگرکە، هتد.

وابزانم لێرەدا قسەمان لە کوێر کردنەوەی ئەم دەستوورە چەسپاوەی هێڵان و نەهێڵانی نیشانەکە نییە چونکە قرتانەکە دەستوورییە نەک بیژۆک، قسەمان لە چۆنیەتی نووسینی وشەکانە لە هەردوو حاڵەتدا... لێرە بە پێشەوە لە نێوان باسی پێشگردا کە هاتمە سەر باسی نیشانەکانی فەرمان و نەهی و نەفی و مضارعە قسەم لە قرتان و نەقرتانی ئەم نیشانەیەی ئەمرە کرد و ئێستا ناگەڕێمەوە سەری، ئەم پێدا هاتنەوەش داخوازیی سەرەباسی قوت دانی دەنگ بوو کە لە بانگەوازەکەدا نووسراوە. بەڵام ئەوەندە دەمێنێتەوە کە بڕیار بۆ قرتاندن و نەقرتاندنی نیشانەکە لە هەندێ بار و حاڵەتی فیعلی لێکدراودا بدرێ وەک کە دەگوترێ، سەربڕە، دەغڵەکە ڕۆکە، قوڕەکەماڵنج دە، پیاوی چا بە لێرەدا «چاک»یش لێی قرتا... هتد. بە ڕای من نە نەزەر هەیە لە بەجێهێشتنی مەسەلەکە بۆ دڵخوازی نووسەر و ئاخێوەر نە سوودیش هەیە لە سەپاندنی ژیاندنەوەی ئەو نیشانەیە چونکە مادەم قرتاندنەکە شکڵی دەستووری وەرگرتووە زەرەر لە هیچ سەروبەرێکی ڕێزمان و نووسینی ئەدەبی نادات بۆ نموونە، دەتوانی بڵێیت «لاکەوە - سەرکەوە - پێشکەوە - دوورکەوە - نێزیککەوە» بەڵام ناتوانیت بڵێیت «دەرگاکە کەوە...» فەرق کردنی شیان و نەشیانی قرتاندنیش لەو شوێنانەدا کاری سەلیقەیە ئەوەی لە خۆیشی ڕانەبینێ قرتاندنەکە لە جێی دروستدا بکات با خۆی لە دوودڵی ڕزگار کات و نیشانەکە بەکاربهێنێ...

ڕێژەیەکی دیکەی فیعل هەیە دەنگێکی «ب»ی تێدا دەقرتێ بە ڕواڵەت هەر دەڵێی نیشانەکەی ئەمرە بەڵام هەو نییە و شتێکی دیکەیە، لە گەلێک ناوچەی کورد زماندا لە جیاتی بمکردبایە، بچووبامایە... دەڵێن بمکردایە، بچوومایە - ئەم «ب»ە لێرەدا شکڵێکی فیعلی «بوون» ـە، هەرچی «ب» ی سەرەتای فیعلەکەیە ئەویان نیشانەی ئەمرە (لە ڕاستیدا لێرە نیشانەی خۆزی وەیا مەرج و شتی ئەوتۆییە و لەگەڵ ئەمردا لەوەدا کۆ دەبنەوە کە هەموویان فیعلی ئینشائین...). هەڵبەت ئەم قرتانەش هی دەست لێدان نییە و خەڵقی لێ مەنع ناکرێ.

ئەو فیعلانەی کە بە دەنگی «ە» دەست پێ دەکەن سەرەڕای «ب»ی نیشانەی ئەمر هێیەکەشیان دەقرتێ وەک کە دەگوترێ «هەڵێنە، هەڵاوێژە، تێوەرێنە، هەڵێ...» لە جیاتی «هەڵبهێنە، هەڵبهاوێژە، تێوەربهێنە، هەڵبهێ...». بەشێک لەو فیعلانەی کە بەهەمزە دەست پێ دەکەن وا دەبێ هەمزەکەیان دەقرتێ وەک «داخێوم، بنگێوە...» لە جیاتی «دەئاخێوم، بئەنگێوە»... لە بارەی وشەی «بنگێوە»وە لە شیخ عەلی تاڵەبانی دەگێڕنەوە کە لە پیریدا گوتویەتی «کاتی خۆی کە مامۆستای سوختەخانە لە حینجە کردندا دەیگوت «بێژێر بی بنگێوە سینێ...» عەلی کوێر بێ نەمدەزانی مەبەستی وەستاندنی سینەکەیە». لەمەوە دیارە کە تێبردنی ئەو هەمزەیە لە کۆنەوە و بە بەرینایی کوردستان باو بووە.

ڕای من لە بارەی ئەم جۆرە سوان و قرتانە ئەوەیە کە هەروەک لە عەرەبیدا «یستطیع» و «یصطیع» ڕەوان، لە کوردیشدا بە مەرجی نەشێوانی ڕیزی دەنگی وشەکان شێوەی سواو و نەسواوی وشەیەک کە لە زوربەی لەهجەکاندا باو بێ هەر ڕەوایە بەڵام دیارە نەسواوەکەی پەسەندترە.

وشە هەیە دەقی کۆنی ماوە بەڵام سواوەکانی پتر لە کاردان وەک وشەی «خاتوون» کە تەنها بۆ ناوی کۆک و لە شێوەی ئاوەڵناودا بەکاردێت وەک

ئەوەی یەکێک ناوی «خاتوون» بێ وەیا بگوترێ «کیژێکی خاتوونە» لەوە بەولاوە سێ جاران کورت کراوەتەوە بۆتە «خاتوو، خات، خا» پتریش لە ئەسڵەکە مەبەست ڕادەگەیەنن، تەنانەت جارێکیان لە ئەدیبێکی کوردم بیست گوتی گوێم لێ بوو بانگ کرا «خافاتم» دەرحاڵ بیرم بۆ ئەوە چوو کە ئەم «خا»یە دەشێ ببێتە نیشانەی مێینە لەو وشانەدا کە پێویستیان بە جودا کردنەوەی نێر لە مێ هەیە وەک «خادکتۆر، خاوەستا، خاسەرتاش...». لەم وشەیەدا ژیاندنەوەی «خاتوون» لەجیاتی لەقەبی «خاتوو» سوودی نییە چونکە ئێستاکە هەردوو وشە خزمەتی ئاخاوتن دەکەن و هەریەکەیان لە مەودای خۆیدا. «خات» و «خا»ش لە شوێنی تایبەتیدا هەر ڕەوان چونکە بە فرەوانی لە کاردان و ڕێزی دەنگەکانیشیان نەشێواوە، ئەگەر «خات» بوبایە «تاخ» بیژۆک دەبوو.

لە بەرەی فیعلدا ڕێژە هەن لە لەهجەیەکەوە بۆ لەهجەیەک جوداوازیی تێدا پەیدا بووە وەک، گوتبێتم — گوتبم، دەڕوێت — دەڕۆی، کردوەتی — کردییەتی — کردیتی، دیتومە - دیتۆتم، نووستوومە - نووستۆتم، دەچێتن — دەچێت — دەچێ. بە لای منەوە تا ئەو ڕۆژەی بڕیار لەسەر یاساغ کردنی ئەم مامڵەت جوداییە دەدرێ هەموویان ڕەوان بەڵام وا چاکە چی لە لەهجەی سلێمانیدا باوە ئەویان بەکار بێت هەرچەند لەوێشدا مامڵەت جودایی هەیە. بەڵام دەتوانم بڵێم لە نێوان دوو ڕێژەی «کردبام، بمکردایە» دا پێویستە «کردبام» ڕێژەی ئیحتیمالی بێت وەک «ئەگەر کردبام پێمەوە دیار دەبوو» بمکردایەش بۆ خۆزی خواستن بێ وەک «کاشکی بمکردایە، بمکردبایە».

باسی قرتان و سوان دەمانهاوێتە سەر لێکۆڵینەوە لە باسی بەسەرەوەنان و لێ زیاد کردن، لێرەشدا کارمان هەر بەو لێزیادکردنە هەیە کە لە شێوە ئاخاوتنی سلێمانیدا دەکرێ چونکە هەر خۆی بنەمای زمانی ئەدەبیمانە و کەس گوێ ناداتە ئەو ناوچانەی لە بری «بەڵام» دەڵێن «...بەرانەکێنی».

ئاخیوەری سلێمانی لە هەندێ شوێنی ئاخاوتندا زیادییەک دەخاتە کۆتایی وشەوە وەک زیادیی «وانێ» بە دوا کار و دەستەی ناودا. من بەش بە حاڵی خۆم تا ئێستا لە کەسم نەبیستووە و نەشمخوێندۆتەوە لە بنەچەک و سەرچاوەی ئەم زیادییەی کۆڵیبێتەوە. ئەوەندی نووسینی کۆنی سەر بە زمانە ئێرانیەکانیشم هاتبێتە بەرچاو نەمدیتوە شتێکی وەک «وانێ» باو بووبێت، وەک بشزانم تەنها لە سلێمانی و شوێنی لەووەوە نزیک بەکاردێت، ڕەنگە ڕاستیش بێ بگوترێ فەرق بە کەم بوونەوەی دەکرێ نەک بە زیاد بوونی بە تایبەتی لە نووسیندا.

هەرچەند لە زۆر حاڵ و باری تایبەتیدا حەز لە بیستنی ئەم «وانێ»یە دەکەم، وەک کە گوێم لێ دەبوو لە چیرۆکە تەمسیلیەکانی ڕەفیق چالاک بە جۆری ڕەزا سوک لە دەمی ئاکتۆرەکان دەهاتە دەرەوە، دیسانەوە بە بارگرانییەکی بێلزومی دەبینم بەسەر نووسینی ئەدەبیمانەوە. جگە لەو گرانی و بێلزومیە دەشبێتە ئەزمونێکی ئەبەدی بۆ دانیشتوی دەرەوەی سلێمانی کە هەتاهەتایی زماناسیی خۆی تێدا تاقی بکاتەوە لەوانەیشە دوای مەشق و خۆڕاهێنان ئنجا بڵێ «چەند خۆشە بەهارەوانێ، دەچم بۆ کڕینی میوەوانێ...».

زیادیەکی دیکە ئەو «ر»ە لاوازەیە دەچێتە کۆتایی ڕێژە ئەمری وەک «بچۆرەوە، بممەرەوە». ئەوەی سەرنج ڕادەکێشی نەهاتنی «ر»ەکەیە لە کۆتایی غەیری ئەم ڕێژەیەدا هەرچەند پاشگرەکەشی پێوەبێ دەگوترێ «چۆوە، ئەچێتەوە، ئەمماتەوە، ئەیخوێندەوە...» فیعلی وەک «بممەرێ»، «مەمخەرە هاوییەی هەولی فیراق»یش هەر لەم بابەتەیە، وەک دەبینین نەهیش وەک ئەمر وایە...

ئەم زیادییەش سەرچاوەی ڕوونی نییە و هەر لە سلێمانیش باوە. بێگومان ئەمیش وەک «وانێ» هەقی بەسەر نووسینی ئەدەبی یەکگرتووەوە نییە و ناشێ بەسەر هەموو کورددا بسەپێ. ناوناوە لە لەهجەی دیکەشدا زیادیی بۆ

هەندێ وشە دێت وەک کە لە نێوان بەشێک لە عەشیرەتەکاندا وشەی «دەگیرێ» دەبێتە «دەگیرەرێ»... عومەر دەبێتە «عومبەر»، «کەسسارە» دەبێتە «کەستارە». بەڵێ دەزانم ئەم زیادییانە دەستووریان نییە وەک «ڕ»ە لاوازەکە دەستووری هەبوو بەڵام بە هەمەحاڵ ئەوانیش زیادین و ڕەنگ بوو ئەگەر لە سلێمانی باو بوونایە خۆیان بۆ ناو شێوە نووسینی ئەدەبی نامزەد بکردایە وەک کە فیعلی «یەت» لە بری «دێت» وەیا «یەکێکی کە - لە بری یەکێکی دیکە» بە ڕاشکاوی دەنووسرێت.

لە لایەنی بوونی دەستووریش لە هێنانی ئەو «ر»ەدا زوربەی هەرە زۆری کوردیش کە بەکاری ناهێنن لەسەر دەستوورێکی گشتی دەڕۆن کە نەک تەنها لەو ڕێژەیە بگرە لە هیچ ڕێژەیەکدا زیادیی ئەوتۆیی ناهێننە ناو ئاخاوتنەوە، خۆ ئەگەر بە ڕێکەوت لێرە و لەوێ زیادییەکیش هەبێ کەس گوێی ناداتێ ڕەنگە هەر نەشی بیسن وەک کە لە دەشتی کۆیێ دانیشتوی چەند دێیەک لە جیاتی مانگەشەو دەڵێن «مانگاشەو» هەروەها دەڵێن «دوانان» و «سێیانان» لە جیاتی «دوان» و «سێیان». وشەی گەمەش دوو جار کۆ دەکەن و دەڵێن گەمانان. هەر ئەوانیش ڕێژەی فیعلی تێپەڕ لە هەندێ شێوەیدا دەدەنە فیعلی تێنەپەڕ وەک کە دێن دەڵێن «نووستۆم، چۆتم، و هاتۆتمەوە...». لە بەری سلێمانی لە بری ئەمانە دەڵین چووم، هاتووم، کە فیعلەکەش تێپەڕ بوو دەڵێن «کردوومە - کردوەتم». گوێم لێ بووە گوتراوە ئەم «ر»ە لەم شوێنەدا هاتووە تاکوو بزوێنی بەرایی پاشگری «ەوە» بپارێزێ کە لەو ڕێژەیەدا بە دوا بزوێندا دێت. دیارە بزوێنیش بە بزوێنەوە نالکێ. لە وەرامی ئەم بەڵگەیەدا دەڵێم:

1) دەزانین نیشانەی پێناسینیش بە خۆی و بزوێنەکەی پێشیەوە وا دەبێ دەکەوێتە دوای بزوێنی ئەلفەوە کەچی ئاخێوەری سلێمانی بزوێنەکەی پێناسین تێدەبات و نە «ر»ی لاواز و نە هیچ دەنگێکی دیکەش ناهێنێ بۆ پاراستنی ئەو بزوێنە بە نموونە دەڵێ «براکە،

چراکە» کەچی لە گەلێک شوێنی دیکەدا «ی»ی پێوەندی دێنن و بزوێنی نیشانەکەی پێ دەپارێزن و دەڵین «برایەکە، چرایەکە».

2) لە سلێمانیش بە زۆری کە ڕێژەی ڕابردووی بەردەوام دەهێنن و پاشگری «ەوە»ی دەدەنێ بزوێنی بەرایی پاشگرەکە تێدەبەن وەک کە دەڵێن «ئەچۆوە، ئەبۆوە - لە جیاتی ئەبوەوە، ئەچوەوە...» کەچی بە دوا ئەلفدا بزوێنەکە دەپارێزن وەک کە دەڵێن «گەڕایەوە، بووژایەوە» لە جیاتی «گەڕاوە، بووژاوە».

3) هەر لە سلێمانی دەڵێن «ئەم پەنجەرەیە، ئەو پیشەیە» بەڵام کە وشەکان کۆکران بزوێنەکەی دوای ناوەکان تێدەبەن و دەڵێن «ئەم پەنجەرانە، ئەو پیشانە» لە بری «ئەم پەنجەرەیانە...».

4) لە سلێمانی و غەیری سلێمانیش وشە کە کۆکرا بزوێنی «ە» فەتحەی کۆتایی وشەکە تێدەچێت وەک «پەنجەران، شەدان...».

کورتەی قسە ئەمەیە کە پاراستنی بزوێن نابێتە هەنجەتی هێنانی ئەو «ر»ە لاوازە، پاراستنی بزوێنەکەش وەنیە لە هەموو حاڵاندا بەر دەستوورێکی گشتی بکەوێ، ئنجا لە هیچ نموونەیەکدا نادیترێ بزوێنەکە وەیا بزوێن بە گشتی بە هێنانی «ر» بپاریزرێ، ئەوەی وەک «نون الوقایة» بزوێن دەپارێزێ لە کوردیدا دەنگی «ی» ـە. کەواتە دەبێ لە جیاتی «بڵێرەوەوانێ» بنووسین «بڵێوە» خۆ ئەگەر ئەمەش نەسەلمێندرێ نابێ «بڵێوە» کوێر بکرێتەوە چونکە ئەمیان ڕاڕەوی دەستووری و زۆرینەی ئاخێوەرە.

گیروگرفتی ژمارەکان لە 11 تا 19

لێرەدا گیروگرفت کە لە دوو ڕووەوە هەڵدەستێ

- یەکەم لەو «ن» ـەی کە لە زاری سلێمانیدا دەکەوێتە ناو ژمارەکانی 11، 12، 13، 16.

- دووەم لە قرتانی دالی «یازدە، دوازدە، سێزدە، پازدە، شازدە» ئەویش هەر لە زاری سلێمانی.

بە دوا ئەو گرفتانەدا بادانەوەیەکیش بۆ ژمارە 7 پێویستە.

لە بارەی ڕووی یەکەمەوە کە نوونی ژمارەکانی 11، 12، 13، 16 یە، ڕوونکردنەوەی ئەم گرفتە بەم جۆرە دەبێ

سەرنج بگرین دەبینین لە ژمارەکانی 14، 17، 18، 19 گرفتی ئەو نوونە لە لەهجەی سلێمانیشدا پەیدا نییە چونکە لە هیچیاندا نوون نییە. ژمارەی 14 لەوەدا پرسیار پەیدا دەکا ئایا بە ئەسڵ «چوار و چواردە» یاخود «چار و چاردە» یە؟ بەلای منەوە «چوار» ڕاسترە چونکە واوەکە لە زمانی دیکەشدا دەردەکەوێ وەک Four ی ئینگلیزی، تەنانەت کە دێن بۆ «چارەگ» وشەی Quarter بەکاردەهێنن لەوێشدا واوەکە پارێزراوە. لە فارسیدا وشەی «چهار» بەلای «چار»دا دەچێتەوە چونکە ئەو دەنگەی «ه» بەرەو قرتان نزیکترە تا ئەوەی ببێتە «و» بەڵام زۆرینەی زمانە ئەوروپییەکان کە واوەکە دەپارێزن وشەکە بەلای «چوار»دا دەبەنەوە وشەی «چارەگ» کە واوەکەی دۆڕاندوە و کافەکەشی کردوە بە گاف نەیتوانیوە وشەی «چواریەک» بکوژێت. بۆیە دەتوانین بڵێین «چارەگ« سوان و گۆڕانی بەسەردا هاتووە نەک ڕەسەنە.

لە ژمارەکانی 14، 17، 18، 19 دا گرفتی پەڕینی «د» ەکەش پەیدا نییە چونکە ئاخێوەری کورد بە تێکڕایی دەیڵێت تەنانەت کە دانیشتووی سلێمانی

دەڵێ «حەڤڤە» دالەکەی سەلماندوە بەڵام لە شێوەی گوشینی ڤێیەکە دەربڕیوە. لە نموونەکەی 15 ی شێوەی سلێمانیش گرفت نییە چونکە بە ئەسڵ وشەی پێنج نوونی تێدایە.

گرفت لە ژمارەکانی 11، 12، 13، 16 دا هەیە و لە پەڕاندنی «د»ەکەی ژمارە 15 ش بە پێی ئاخاوتنی سلێمانی.

لە لەهجە ئاخاوتنی سلێمانیدا دەگوترێ «یانزە، دوانزە، سیانزە، شانزە» لەمەشدا دوو جاران ماملەت جودایی کردوە لەچاو چواردە و هەژدەدا، جاریکیان کە هاتووە دالی ژمارەی 10 ی پەڕاندوە بە پێی دەستوورە گشتییەکەی قوت دانی دەنگی دال. جارێکیشیان کە لە لاوە نوونێکی هێناوە بۆ ناواخنی وشەی ژمارەکان. وا دەزانم لەو وشانەدا پەڕاندنی دالەکە یەکسەر بۆتە ڕێ خۆشکەرەوە بۆ هێنانی ئەو نوونە بە پارسەنگی تێکچوونی زەنگ و لەنگەری وشەکان. تۆ کە ئەو دالانەت سواند و گوتت «یازە، دوازە، سیازە، شازە» هەست بە نالەبارییەکی فۆنەتیکی دەکەیت و پێت خۆشە لەو نالەبارییە دەرچیت. لە نێوان هەموو دەنگەکانی کوردیشدا تەنها دەنگی نوون لەو شوێنەدا دەبێتە پارسەنگێکی ڕۆح سووک. ئەم ڕاستییەش بە سەلیقە و بە ئەزموون دەردەکەوێ. تۆ سەیری ئەو لەهجانەی کە دالی ژمارەکان دەهێڵنەوە دێن نوونی 15 وەها سووک دەردەبڕن لە قرتانی نزیک دەخەنەوە و دەڵێن «پازدە» هەر چونکە هاتنی نوون لەو شوێنەدا بە دیار دالەکەوە قورس دەردەچێت. لەمەوە دەردەکەوێ، لادانی ئاخێوەری سلێمانی لە وشە دروست و ڕەسەنەکانی «یازدە، دوازدە، سێزدە، شازدە» لەبەر پەڕاندنی دالەکە ناچارییەکی فۆنەتیکی بووە. بەڵگەش لەمەدا ئەمانەن

1- وشەکان بە ئەسڵ دالیان تێدایە.

2- له هیچ کەرتێکی ئەو وشانەدا – جگە لە پانزدە- بە ئەسڵ دەنگی نوون نییە.

3- بەشی هەرە زۆری کورد نە دالەکە دەقرتێنن و نە نوونیش بە زیادەوە دەهێنن.

ژمارەی 15 دەشێ بە پێی ئەسڵی کەرتەکانی بنووسرێ پانزدە، هەروەها دەشێ بە پێی دەستووری ڕەسەن و دروستی سوانی دەنگ «پازدە» بێ.

ژمارەی 17 کە بەشی هەرە زۆری ئاخێوەری سلێمانی «حەڤڤە»ی دەردەبڕن دەبێ «حەڤدە» بنووسرێ و چ ڕێگەی دیکەی لە پێشدا نییە. ئەسڵی وشەکە «حەفتدە» بووە. لە پێشەوە دەنگی «ت» تێیدا سواوە، ئنجا بە پێی داخوازی دەنگسازی کپی «ف» لە دراوسێیەتی «د»ی ئاوازەداردا بۆتە «ڤ»ی ئاوازەدار و وشەکە بۆتە «حەڤدە».

دەچمەوە بۆ لای ژمارە 7 کە بەشێکی ئاخێوەری کورد «حەوت» و بەشێکیشی «حەفت»ی دەردەبڕێ. ساغ کردنەوەی کێشەکە بە چاکی لە بەسەر کردنەوەی «حەڤدە» و «حەفتا» دا هەڵدێنجرێ چونکە ئەوانەی دەشڵێن «حەوت» لەو دوو ژمارەیەدا دەگەڕێنەوە بۆ بنیچەی وشەکە کە «حەفت» ـە. ئەگەر گوترابا «حەوت، حەودە، حەوتا» ڕێی تێ دەچوو دەمەتەقە لەسەر پرسیارەکە هەڵستێ و گوێ نەدەینە «هفت»ی فارسی و seven ی ئینگلیزی و spet ی لاتینی کە هەموویان بەلای دەنگی «ف» دا دێنەوە نەک «و».

کەواتە ژمارەکان لە نووسینی ئەدەبیدا دەبێ بەم شێوەیە بنووسرێن: چوار، حەفت، یازدە، دوازدە، سێزدە، چواردە، پانزدە یاخود پازدە، شازدە، حەڤدە، هەژدە، نۆزدە... حەفتا، حەفصەد، حەفت هەزار... حەفت ملیار...

## بەشی 4: گیروگرفتی نووسینی کردار لەگەڵ ڕاناو لە ڕووی پێکەوە نووسان و پێکەوە نەنووسانیانەوە.

ئەم گرفتە زۆری بە بەرەوەیە

جارێ با لە پێشەوە بڵێم من لە زاراوەی «کردار» ڕازی نیم و لایەنگیری «کار»م لە بری فیعل، لە خۆڕایش لایەنگیر نیم

1) کار پتر لەگەڵ مطلقی «عمل» ڕێکە، هەرچی «کردار»ە تا ڕادەیەک بەلای ئاکارەوە دەبێتەوە.

2) سێ وشەی «کار، کارا، بەرکار» لە بری «فعل، فاعل، مفعول» زۆر شیرن و ڕێکوپیکن. لە «کردار» وشەی بە واتای «فاعل – کارا» هەڵناستێ.

3) بە تێکڕایی خولی وشەی «کار» بەناو ڕێزمان و فەرهەنگ و زاراوە جوداکانی لکی زانستەکان گەلێک بەر فەڕاح و فرەوانترە لە هی «کردار» وەک وشەی «کارگێڕ، کارم پێت ماوە، کارامە، سەرکار، کارم خوێندنە... کاریگەر» هەمووشی بەلای کردن و جموجۆڵەوە دەڕوات. کاتی خۆی کە کۆڕی زانیاری کورد وشەی «کار»ی لە بری «فعل» پەسەند کرد دەیزانی «کرادر»یش هەیە بەڵام تای «کار»ی نەدەکردەوە مەعلوومیش بوو بەلایەوە کە «فرمان» هەر بە جارێ بێ کەڵکە چونکە لە «فەرمان»ی ئەمر کردنەوە هاتووە، لە واتاشدا کە دەڵێی «فرمانی خۆم جێبەجێ کرد» وەک ئەوەیە کە بڵێی «واجبی خۆم بەجێ هێنا» ئنجا وشەی «واجب» ببێتە «فعل»ی قەواعید؟ وا دەزانم چاوەڕوان ناکرێ لە سەپاندنی زاراوەیەکدا پتر لەو بەڵگانەی بۆ «کار» ڕەچاو کراون ڕەچاو بکرێ.

ئنجا کە نەسەلمێندرێ چۆن پێشنیازی کۆڕ و غەیری کۆڕ بڕ دەکات؟

بگەڕێمەوە بۆ کێشەی کردار و ڕاناو.

نازانین مەبەست لە «ڕاناو» چییە؟ کرداریش هەر بە ڕاناوەوە نانووسێت، ڕاناویش هەر بە کردارەوە نانووسێت. لە پێشەوە بزانین ڕاناو لێرەدا دەبێ چی بێ؟

بەشێکی زۆری زمانەوانانی کورد شوێنپێی ڕێزمانە مەشوورەکانی دنیا هەڵدەگرنەوە و ڕاناو دەکەن بەو چەند بەشەی لەواندا دیار کراوە، لای هەندێک لەو زمانەوانانە ژمارەی ڕاناو دەگاتە هەشت، لای هەندێکی دیکەش دەگاتە حەفت و بەرەژێرتریش. لە ڕووی نووسینەوە ناشێ لەو هەموو بەشانەدا یەک پێوانە بەکاربێت. بە نموونە ئەوەی پێی دەڵێن ڕاناوی ئیشاری «ئەمە، ئەوە، هۆوە، ئەمانە...» کۆ نابێتەوە لەگەڵ ئەوەی پێی دەڵێن ڕاناوی هەیی کە بریتییە لە وشەی «هی» وەیا ڕاناوی گەیەنەر کە بریتییە لە «کە»ی ناو ڕستەی وەک «ئەوی کە پێم گوتیت». بەپێی ئەو دابەش کردنانە سەرلەبەری وشەکانی ڕستەی «ئەو هیچانەی کە هی تۆن و هی منن» ڕاناون. وەک دیارە بەشی زۆری ئەو ڕاناوانە لە ڕووی ڕێنووسەوە فەرقیان نییە لەگەڵ وشەی عادەتیدا، بۆیەیە وا دادەنێم کە مەبەست لە ڕاناو ئەوە بێ پێی دەڵێن «ڕاناوی کەسیی» وەک «من، تۆ، ئێوە» لەوێشدا مەبەست ڕاناوی لکاو بێ چونکە سەرێشەی گەورە لە چۆنیەتی نووسینی ئەودا پەیدایە.

ڕاناوی لکاو نەک هەر بەرکارە بگرە بە هەموو وشەیەکەوە دەلکێت. دەستووری گشتیی چۆنیەتی نووسینی ڕاناوی لکاویش وەک لە ناوەکەیەوە

دیارە ئەوەیە کە دەبێ هەمیشە بە وشەی پێش خۆیەوە بلکێ وەک: دەستمان هەڵگرت، برام هات، دیتمان، منم، بمگرە، من دۆستتم... دەبینی ڕاناوی لکاو بە ڕاناوی لکاوەوە دەنووسێت هەردووکیشیان پێکەوە بە وشەی پێش خۆیانەوە دەلکێن ئەو وشەیە هەرچی دەبێ با ببێ.

تا ئێرە گرفت لە جۆری نووسینی ڕاناوەکاندا نابینم، بەڵام لەو حاڵەتەدا کە ڕاناوی لکاو جێگۆڕکێ دەکات پێویستە بڕیار لەسەر چۆنیەتی نووسینی بدرێت بە نموونە «دەگرم» دەبێتە «دەمگرت، نەمدەگرت، هەڵم نەدەگرت، پێم هەڵنەدەگرت». ئنجا دەگوترێ «هەڵم نەگرتبای» وەیا «تێیان هەڵنەپێچابایەنایە، پێیان وەرگەڕاندبووین. تێم ڕانەدەدیتیت»...

ئەگەر ئارەزوو بکەین دەتوانین دەمەتەقە و بەڵگەکاری دوورودرێژ لەسەر چۆنیەتیی نووسینی ئەو ڕستە وەیا دەستەواژانە هەڵستێنین بەڵام لێرەدا هەم بە نیازی کورت کردنەوەی قسە و هەم بە هۆی ئەوەندە ڕووناکییەی کە تا ئێستا هاتووە بۆ ناو تێکڕای گرفتەکان بیروڕای خۆم لەم چەند خاڵەدا لەبارەی کێشەکەوە دەردەبڕم

1) کە ڕاناوەکە کەوتە نێوان کار و نیشانەکانی «مضارعە، أمر، نهی، نفی» بە هەردوو لای خۆیەوە بلکێ لەو ڕووەوە کە ئەو نیشانانە بە کەرتی تەواوکەری فیعلەکە حیساب دەکرێن ئیتر بنووسرێ «دەتبینم، بتبینم، ناتبینم، مەمبینە، بمبینە، نەتدیتم...».

2) ناوناوە وا دەبێ دوو نیشانە دێنە بەرایی فیعلەوە وەک «نەدەڕۆیشتم» کە فیعلەکەش تێپەڕ بوو ڕاناوی فاعیل دەکەوێتە نێوان هەردوو نیشانەکەوە وەک «نەتاندەدیتم...» من وا بە باش دەزانم لەم حاڵەتەشدا کەوا ڕەنگە تاکە حاڵەت بێ، هەردوو نیشانەکە و ڕاناوەکە وێکرا بە فیعلەکەوە بلکێن، هەم لەبەر ئەو

هۆیەی کە لە خاڵی یەکەمدا باس کرا هەم لەبەر ئەوەی کە نیشانەکان لەلایەن لکانەوە لە پێشگر و لە دەستەواژە و لە وشەی سەربەخۆی وەک «ناو، ڕاناوی نەلکاو، ئاوەڵناو، ئاوەڵکار» جودا بکرێتەوە، واتە ئەگەر ڕاناوی لکاو کەوتە نێوان ئەو وشانە و فیعلەوە بەوانەوە بلکێت و لە فیعلەکەیان دووربخاتەوە وەک «هەڵم گرت، منت دیت، پیاوانەیان دەدواندین، عاقڵت شێت کرد، بەتەنگەوەیان بووین».

3) لە حاڵەتی هاتنی ڕاناو بە دوا فیعلدا، کە یەک ڕاناو بوو بە پێی دەستووری گشتیی بە فیعلەکەوە بلکێت «دیتم، هاتیت، دەچووین». کە بوون بە دوو ڕاناوی یەک لە دوا یەک وەک «دیتمت، بیستمن، دیتیانین...» ئەوساش هەردوویان وێکڕا بە فیعلەکەوە بلکێن. کە پاشگری «ەوە»ش بە فیعلکەوە بوو بە دووەم ڕاناوەوە بلکێت «دیتمنەوە، دیتیانینەوە...» خولاسە چەندێک ڕاناوی لکاو و پاشگر و نیشانەی خۆزی بە دوا فیعلدا بێن هەموویان پێکەوە پێیەوە بلکێن وەک «نووستبامایە، بتخواردایە، بماندیبات، هەڵم کێشابایت».

هەر لەبارەی کێشەی ڕاناوی لکاوەوە پێویستە باسی ئەوەش بکەم کە لە هەندێ ناوچەی وەک دەوروبەری کەرکووک لە جیاتی «دیتانین، بیستمانیت...» دەڵێن «دیتمانیان، بیستتمان...» وەیا کە شێخ ڕەزا دەڵێ «خۆی کرد بە نێرە تورک و لێمی خوڕی کیم بلرسزی» لەجیاتی «لێی خوڕیم...» ڕاستییەکەی ئەم بەکارهێنانە لەوانەیە باشتر بێ لەوەی لە بەری سۆران و موکریان و بابان و نازانم کوێ باوە چونکە لە هەندێ باردا ئەم دارشتنە ڕاگەیەنترە وەک کە دەڵێ «پێیم گوت...» مەفعوولی ڕاناوی کەسی سێیەم دەردەکەوێ کەچی لە لەهجەکانی دیکەدا ڕاناوەکە دەرناکەوێ و دەڵێن «پێم گوت». ئێمە دەزانین کە کەسی سێیەمی تاک مەفعوول بوو ڕاناوەکەی دەرناکەوێ تەنانەت کە دەڵێین «لێم ستاندەوە» دوو مەفعوول

بزره بەڵام کە گوتت «لێیم ستاندەوە...» مەفعوولی دوەم لە شکڵی ڕاناوی «ی»دا دەرکەوت و حەقیشیەتی دەرکەوێت چونکە تەنها یەک مەفعوول دەشێ هەر بە تصور جێی بۆ بکرێتەوە لە ئاخاوتندا وەک کە دەڵێی «دیتم» دەزانین شتێک وەیا یەکێکت دیتوە بەڵام کە بوون بە دوو مەفعوول وا باشە دوەمەکەیان دەرکەوێ. لە لایەکی دیکەشەوە کە لەو لەهجەیەدا دەڵێن «لێتم وەرگرت» ڕاناوی کەسی دووەم کە لەبەر حوکمی «لێ»ی پریپۆزیشنە یەکسەر بە دوایدا هات بەڵام کە گوتت «لێم وەرگرتیت» ڕاناوی کەسی یەکەم کە فاعیلە ئەویان کەوتە بەر حوکمی پریپۆزیشن هەرچی کەسی دوەمە بە سەلامەتی کەوتە دوای فیعلەکەوە... بە هەمەحاڵ ئەم
بەراوردکردنە سەر بە ڕێزمانە نەک بە ڕێنووس، بەڵام ڕێم بۆ دەکاتەوە بڵێم لە هەر لەهجەیەکدا بێ ڕاناوی لکاو دەبێ بە پێی ئەو دەستوورانە بنووسرێ کە بۆ نووسینی ئەدەبی قەرارادە دەکرێ، چ زەرەرێکیش لەوەدا نابینم ئەگەر لیژنەیەکی شارەزای ڕێزمان خەریک بێ ئەو تەرزە بەکارهێنانە و دارڕشتنانە هەڵسەنگێنێ بەڵکوو هی وایان تێدا ڕەچاو دەکات کە لەوەی باوی نووسینە پەسەندتر بن، خۆ هەمووی هەر کوردییە و هیچیان نابنە منداڵی هەڵگیرایەوە...

## بەشی 5: گیروگرفتی ئامرازە لێکدراوەکان (حروف العطف)

زاراوەی «ئامرازی لێکدەر» لە ڕووی واتاوە لەگەڵ «اسم الموصول»دا ڕێک دێت هەرچی «حروف العطف» ـە لەگەڵ وشەی «پێوەندی»دا پتر دەگونجێ. بەڵام لێرەدا پێڕەوی بانگەوازەکە دەکەین و بە «عاطف» دەڵێین «لێکدەر». هەرچەند تا ئێستا ڕێکەوتنی گشتی لەسەر تێکڕای ئەو وشانەی بە لێکدەر دانراون پەیدا نەبووە دیسانەوە دەتوانین بڕیاری وەها بدەین کە لە ڕووی چۆنیەتی نووسینیانەوە هەموییان بگرێتەوە.

ئامرازی لێکدەر هەر کە ناوی ئامرازی وەرگرت دەبێتە یەک لەو چەند بەشە سەربەخۆیەی کە زمانی بەسەردا دابەش دەکرێ وەک ناو، کار، ئاوەڵناو... دیارە کە لە ڕێزماندا سەربەخۆ بوو دەبێ لە نووسینیشدا بە جودا بنووسرێ. بەڵام کە بێین وشە لێکدەرەکان بخەینە بەر نیگای سەرنجەوە چەند تێبینییەک خۆ ڕەپێش دەکات

1- وشە مەشوورەکەی «عطف» کە فارسی و کوردی و تورکیش تێیدا هاوبەشی عەرەبین واوی عەتفە. لە بارەی ئەم واوەوە دەبێ دوو خاڵ ڕەچاو بکرێ

خاڵی یەکەم ئەوەیە کە شکڵی «وە» ئامرازە سەریحەکەی عەرەبییە بە زەقی ڕادەگوێزرێ بۆ ناو ئاخاوتنی کوردی. لەبەر ئەمە پێویستە دوورەپارێزی لێ بکرێ وەک کە دوورەپارێزی لە «بلی بەلا» دا دەکرێ و دەگۆڕێ بە «بەڵێ».

خاڵی دووەم چۆنیەتی نووسینی «و» ی عەتفە وا بزانم نووسەران هەموویان واوەکە بە جودا دەنووسن و نایلکێنن بەڵام هەندێکیان لە نزیک وشەی پێش خۆیەوەی دەنووسن هەندێکیشیان لێی دووردەخەنەوە. بەلای منەوە هەردوو شێوە نووسین بەڵگەی خۆی لەگەڵ خۆیدایە، تەنها ئەوەندە هەیە کە ئێمە

بڕیارمان دا به جودا بنووسرێ بۆچی وەکوو وشە جوداکانی دیکە لە دوورەوەی وشانیەوە نەنووسین؟ ئەگەر بگوترێ دوورخستنەوەی وەهای دادەبڕێ کە ئیتر نەشێ ببێتە بزوێن بۆ وشەی پێشیەوە، لە وەرامدا دەڵێین نزیک خستنەوەشی لە وشەی پێشیەوە مافی ئەوەی لێ دەستێنێ کە پێیەوە نەلکێ. جگە لەمە، جاری وەهاش هەیە واوەکە بە دوا هەندێ وشەدا ئەگەر لێی دوور نەخرێتەوە بە پیتی ئەو حیساب بکرێ بە تایبەتی بۆ ئەوانەی لە خوێندنەوەدا جارێ شلکن، واش دەبێ بە دوا وشەیەکدا دێت کە کۆتاییەکەی دەنگی واوی تیژە. ئنجا ئەوانەی واوی تیژ بە دوو واو دەنووسن لێیان ناقۆڵا بەدەر دەداتەوە. بە هەمەحاڵ وا دەزانم چاکتر ئەوەیە لە دوورەوە بنووسرێت. پێی ناوێ بڵێم لە خۆوە دیارە کە دەبێ تەنها یەک واوی بێ نیشانە بۆ ئەم واوەی عەتف دابندرێ هەر نەبێ لەبەر ئەوەی کە بەدوا بزوێندا هات واوەکە دەبێتەوە کونسنانت و نیشانە قبووڵ ناکات.

لە حاڵێکدا واوەکە بەشداری دروست کردنی وشەی فەرهەنگی بوو دەبێ لە سیفەتی عەتف و سەربەخۆیی بکەوێت و بە پێش خۆیەوە بلکێت، وەک لە وشەکانی «هاتوچۆ، هیچوپووچ، شتومەک...» و هی ئەوتۆییدا واوەکە بۆتە کەرتی پێکهێنەر. هەرچۆنێک بێ ناشێ لە وشەکانەوە دووربخرێتەوە. ئەمە دەڵێم لەبەر ئیحتیمالی پەیدا بوونی گرفت لە نووسینی وشەی وەک «هەرچی و پەرچی» چونکە ئەگەر بڕیار نەدرێ لەسەر دانانی نیشانە بۆ «ی»ی تیژ ئەوساکە واوەکە بە چیمەکەوە لێکدرا لەوانەیە بخوێندرێتەوە «هەرچییو پەرچی».

لە وشەی وەک «سەرو سەر، کەلو کەل، ملو مل، دەشتو دەشت...»دا واوەکە نەبۆتە کەرتی پێکهێنەری وشە لەوەش دەرچووە عەتفی ڕووت بێ لەبەرئەوە پێویستە بە جودا لە نزیکەوە بنووسرێ.

2- وشەی «هەر» لەگەڵ «کوێ، کەی، کام، سات...»دا سیفەتی عەتف دەدۆڕێنێت و دەبێتە جۆرە وەسفێک بۆ ئەو وشانە. لەبەرئەمە لێیانەوە نزیک دەخرێتەوە. بەڵام کە گوتت «لە نێوان فلانە کۆمەڵە وشەدا هەر کام بۆ پرسە» دەبێ «هەر» دووربخرێتەوە چونکە بۆ عەتفە.

3- وشەی، وەیا ڕاستی، دەنگی «ش»ی عەتف بێ چەند و چۆن بە پێش خۆیەوە دەلکێت وەک «بیتوێنیش دەشتە، شوتیش هەرزانە، منیشت دیت...». کە هات و کەوتە نێوان نیشانەکانی مضارعە و نەفی و نەهی و ئەمر و نێوان فیعلەوە دەبێ بە هەردوو لاوە بنووسێت وەک «بشخۆ، مەشڕۆ، دەشچێ، نەشچوو، ناشچێ، نەشڕۆشتایە، بشڕۆشتایە». وا دەزانم لە ڕابردووی بەردەوامدا کە لەگەڵ نەفی هات وەک کە دەگوترێ «نەشدەهاتم» هەردەبێ بە دوا خۆیەوە بلکێ بەڵام کە ڕاناو هات و کەوتە دوای «ش»ەوە جودای بکاتەوە وەک «نەشم دەزانی». بەهەمەحاڵ ڕاناو هەمیشە شینەکە لە وشەی دواوە جودا دەکاتەوە جا ئەگەر شینەکە بە دوا پێشگر و نیشانەکاندا هات پێکرا لەگەڵ ڕاناوەکە لە نزیک وشەی دواوە بنووسرێن وەک «هەڵیشمگرت، بشمگرتایە، نەشمدیت، مەشمبینە، ناشمدوێنێ...» بەڵام کە بەدوا دەستەواژە و وشەی سەربەخۆدا هاتن تێکڕایان بە جودا دوور لە وشەی دواوە بنووسرێن «خانووشم کڕی، سەفەریش دەکەم، سەرەو هەورازیش دەڕۆم...».

ئەم مامڵەت جودایيە داخوازیی ڕێزمانە، جا ئەگەر ویسترا بە نیازی ئاسان کردن یەک مامڵەت لەگەڵ وشەی سەربەخۆ و دەستەواژە و پێشگردا بکرێت و هەموویان دوور لە وشەی پاشەوە بنووسرێن دەبێ مامڵەتی نیشانەکان هەر جودا بێ و لەگەڵ «ش»ەکە وێکڕا بە دوا خۆیانەوە بلکێن وەک بشڕۆ، دەشبینێ، دەشچوو، نەشدەچوو.

4- «نە»ی «عەتف – نەفی» بە جودا لە دوورەوەی وشانەوە دەنووسرێ وەک نە دەخۆم نە دەخۆمەوە، نە دارا و نە برزوو، نە دەشهات و نە دەشچوو... هتد.

## بەشی 6: گیروگرفتی وشە لێکدراوەکان لە بارەی پێکەوە نووسان و...

وا بزانم لەناوتویژی چی لێرە بە پێشەوە باسمان کرد ڕوون بۆتەوە بە پێی باوەڕی من چۆن وشەی لێکدراو بنووسرێ، کاکڵی قسەش لەوەدا ئەوەیە کەوا هەتاکوو وشەی لێکدراو و داڕێژراو و دەستەواژە بەرەو سەربەخۆیی و جۆش خواردنەوە بڕۆن پتر بەیەکەوە لکان هەڵدەگرن. پلەی لکانیش لەوەدا دووە: یەکیان لکانی تەواو، ئەوی دیکەیان لەیەکتر نزیک کردنەوەی کەرتی وشەکان. ئەوەی ڕاستیش بێ ئەو تەرزە وشانە بەهۆی ئەوەوە کە بە هەرجۆرێک بنووسرێن واتا نادۆڕێنن وا لە نووسەر دەکات کە یەک وشە بە چەند جۆرێک بنووسێت بۆیەشە سەپاندنی یەک وێنە بۆ هەر تاکێک لەو وشانە پێویستی بە بڕیار و دەسەڵات هەیە، ئنجا کاتیشی دەوێ تا دەست و قەڵەمی تێکڕای خەڵق ڕادێت لە جۆری نووسینیان بەڵام بێگومان دوای ئەوەی شێوەی وشەکان و جۆری ڕێنووس لە قوتابخانەکان جێگیر دەبن پاش چەند ساڵێک زوربەی خەڵق بەو شێوەیەیان دەنووسێ کە بە دەرس گوتراوەتەوە چونکە هەرچی منداڵە دەچێتە قوتابخانە و هەموویان یەک جۆر ڕێنووس فێر دەبن ئەوساش کارەکە بەند دەبێ بە هەبوونی مامۆستای شارەزا بایی هەموو قوتابخانەکان. ئەمەیش بەولای ئیمکانەوە نییە، زۆریش زەحمەت نییە چونکە ئێمە لەم کارەدا یەکەم هەنگاو هەڵنانێین.

## بەشی 7: گیروگرفتی دانانی نیشانەکان

ئەگەر مەبەست لە نیشانە ئەوە بێ کە لەسەر هەندێ پیت دادەندرێ ئێمە لێی بووینەوە و لە یەکەم بەندی خاڵی یەکەمی بانگەوازەکەدا بووبوە سەرەباس. ئەگەر مەبەستیش نیشانەی مضارع و فەرمان و نەهی و نەفی پێناسین و کۆ کردن و چووک کردنەوە و پاشگرەکانی ناوی مەعنەوی و ئاوەڵکار و ئاوەڵناو و شتی ئەوتۆیی بێ دیسانەوە لە تێکڕایی ئەم نووسینەدا باسیان کرا و گوترا دەبێ ئەو نیشانە و پاشگرانە بە کۆتایی وەیا بەرایی وشانەوە بلکێن. لێرەدا تێبینییەک هەیە باس کردن دەهێنێ.

پاشگر بێهێزتر و ناسەربەخۆترە لە پێشگر، تەنانەت هی وایان تێدایە بە حاڵ وجودی هەیە وەک دەنگی فەتحەی دوای «چاکە، خراپە» وەیا هی دوای «گرزە، ڕووتە». هەرچی پێشگرە هەبوونی سەربەخۆی هەیە با واتای تەواویشی نەبێ چونکە مومکین نییە هیچ بێژەیەک لە پێشەوە بێت و وجودیشی بەند بێ بە وشەی دوای خۆیەوە وەک بزوێنی دوای «خراپە، ڕووتە، جوانیی، سەروو، زانا». پێشگر هەیە وجوودی سەربەخۆ و واتای تەواویشی هەیە وەک «دەر، بەر، لا...». لە وشەکانی «بێدین، بە ناموس»دا پێشگرەکان پریپۆزیشنن کە لە هەبووندا بەشێکی ئاخاوتنە وەک ناو و کار...لەبەر ئەمە پاشگر پتر ئامادەی پێوە لکانە، بگرە نەلکان هەڵناگرێ.

هەر بۆیەیشە نووسەران بە ئاسایی وا دەبێ پێشگر بە جودا دەنووسن وەیاخود کە لەمپەڕ کەوتە نێوان وشە و پێشگرەکەیەوە بە پێی دەستوور پێشگرەکان لێی دادەبڕێن وەیا دوو پێشگر پێکەوە بە فیعلەوە نالکێن. ئەم دیاردەیەی خۆشجڵەویی پاشگر بۆ لکان بە پێش خۆیەوە زۆر بە سەیری، لە پیتەکانی ئەلفوبێش بە دیار دەداتەوە کە دەبینین هەموو پیتەکان بە پێش خۆیانەوە دەلکێن، ئەوانەی کە نالکێن نەلکانەکەیان بە پیتی دوا خۆیانەوەیە.

دوو تێبینی وردیلە هەن دەبنە دوایین ئاڵقەی ئەم زنجیرەیە. یەکیان نیشانەی مضارعەتە کە لە سلێمانی و خۆشناوەتیی و هەندێ شوێنی دیکەدا «ئە»ی بۆ بەکاردەهێنن. ڕاستیەکەی «دە» باشترە لە «ئە» ئەویش لەم دوو ڕووەوە. ڕووی یەکەم ئەوەیە کە لە صەدی نەوەدی کورد «دەڕۆم، دەبیەم، دەمنووسی...» بەکاردەهێنن. ڕووی دوەم ئەوەیە کە لە زاری کرمانجی سەروودا بەولای «دە»وە «دێ»ش هەیە لە بری «سوف»ی عەرەبی وەک دەڵین «دێچم». ئێمە لە جیاتی ئەوەی کەرستەی وەها ڕاگەیەنەر پەرە پێ بدەین نابێ ئیعدامی بکەین چونکە مەنع کردنی «دە» لە پێشەوە «دێ»ش مەنع دەکات.

تێبینی دووەم ئەوەیە کە زوربەی هەرە زۆری نووسەران زۆر بە سەیری لە گەلێک باردا پیتی «ی» دادەبڕن لە وشەی پێش خۆیەوە. بە نموونە کە دەنووسن «لێت ڕازییە» ڕاناوەکەی «ت» بە «لێ»وە دەلکێنن بەڵام کە دەنووسن «لێی ڕازییە» ڕاناوەکەی «ی» لە «لێ» دادەبڕن «لێ‌ی ڕازییە». نووسەران لەم مەملەتەدا دەستووری لکان و نەلکانی پیت هەڵدەگێڕنەوە کە دێن «ی»ی دووەم بە پێش خۆیەوە نالکێنن چونکە وەک پێشتر گوتم «ر، د، و، ز، ا»ش بە پێش خۆیانەوە دەلکێنن، لە نموونەکانیشدا یێی یەکەم بە پێش خۆیەوە لکا «لێت ڕازییە، لێی ڕازییە«. باوەڕ ناکەم هیچ کەسێک وەرامی هەبێ بۆ پرسیارێک کە بڵێ «ئەرێ نووسەری کورد لە کوێوە دەستووری نەلکانی ئەو یێیانەت هێنا؟».

کورتە پێشنیازەکان

لەم چەند دێڕەی خوارەوەدا کورتەیەکی بێ بەڵگەکاری دەکەم بە چەند خاڵ لە بارەی ئەلفوبێ و ڕێنووسەوە.

أ- لە بارەی ئەلفوبێوە

1) ناشێ بۆ تاکە دەنگ دوو پیت دابندرێ.

2) دەبێ نیشانە بخرێتە سەر واوی تیژ و یێی تیژەوە، وەهاش پەسەند دەکەم نیشانەکەیان هەشتێکی بچووک بێت کە دەکاتەوە حەفتی بەرەواژ.

3) دیفتۆنگی «وێ، نگ، ند» هیچیان ڕاستە دیفتۆنگی نژادیی نین چونکە بریتین لەو دەنگە ئاشکرایانەی بە نووسین دەیاننووسین.

4) دالی کلۆر و تێی کلۆر، دال و تێی حەقیقین دەبێ هەر بە پیتە عادەتیەکانی بێنیشانە بنووسرێن.

5) دەبێ پیت بۆ دیفتۆنگی واوی تیژی بادینانی دابندرێ وەیا نیشانەی بۆ ڕەچاو بکرێ تاکوو لە واوە تیژەکەی بێدیفتۆنگ جودا بێتەوە.

6) ئەو دەنگانەی لە کوردیدا نین بەو شێوەیە بنووسرێن کە لە زاری کوردەوە دێنە دەرێ، وەیا بە پیتی زمانی خۆیان بنووسرێن و بخرێنە نێوان کەوانەوە.

7) لەبری «شدە«ی عەرەبی دوو پیتی دەنگە گوشراوەکە بنووسرێ.

8) نیشانە بۆ ڕێی قەڵەو دابندرێ چ لە سەرەوەی بێت چ لە ژێرەوەی.

9) پێویست نییە بۆ «کسرة مختلسە«ی کە من پێی دەڵێم «قورس کردنی دەنگ» هیچ نیشانەیەک دابندرێ. کاتێک باس گەییشتە دانانی ئەلفوبێی لاتینی بۆ نووسینی کوردی ئەوسا قسەی لیوە بکرێ.

10) کەسرە و فەتحە و «ضمە« وەک باوە بنووسرێن «ی، و، ە«.

ب- لە بارەی ڕێنووسەوە

1- وشەی لێکدراو و دارێژراو بە تێکڕایی کە بوون بە وشەی فەرهەنگی هەموو کەرتەکانیان بەیەکەوە بنووسرێن. دەستەواژەی ئاوەڵکاریی و ئاوەڵناویی کە جارێ نەبوونەتە وشەی فەرهەنگی کەرتەکانیان بە جودا لە نزیک یەکترەوە بنووسرێن «چنگ‌لەسەرشان...».

2- وشەیەک کە کەرتی ناتەواوی فیعلی تێدا بەشدار بوو هەمیشە کەرتەکانی بەیەکەوە بلکێندرێن وەک خوێنمژ، دەسکەنە، هەڵکەوت، گورگنەخۆرە، پاشبەند، دەستبەستە، پێڕەوکە... هتد. مەرجیش نییە وشەکە بووبێتە فەرهەنگی.

3- هەرچی ناوی کۆکە مامڵەتی تاکە وشەی لەگەڵدا بکرێ وەک «گوڵبەدەم، قەرەتاژدین، کێلەشین، کاکەمەم، دووگرتکان، کاکەڵڵا، پیرۆتەسور، مەلای‌جەزیریی» ئەم ناوەی دوای چونکە «مەلا» کە تێیدا بە لەقەب ماوەتەوە تا ئەوەی «ی» ئیزافەشی داخوازیی کردوە نەشیا «ی»کەی بە «جەزیری»یەوە بلکێ بەڵام هەردوو وشە لە نزیک یەکدییەوە نووسران. (بۆ لەقەبەکان بگەڕێوە سەر درێژەی نووسینەکە).

4- ناوی عەرەبی و بێگانە ئەگەر وەک خۆیان ڕاگوێزران دەخرێنە نێو کەوانەوە و بە پێی ڕێنووسی زمانەکەیان دەنووسرێن وەک «محمد، خلعتبری، George». بەڵام کە پیتی ئەو زمانانە لە چاپەمەنی وەیا ڕێنووسی کوردیدا نەبوون دەبێ بەو شێوەیە بنووسرێن کە لە زاری کوردەوە دەردێن.

5- پێشگر هی فیعل و هی غەیری فیعل بە دوا خۆیەوە دەلکێ. بەڵام کە دوو پێشگر بەیەکەوە هاتن تەنها ئەوەی دراوسێی وشەکەیە پێییەوە دەلکێ، ئەوی دیکەیان بە جودا لە نزیکەوە دەنووسرێ

أ- نیشانەکانی مضارع، أمر، نەهی، نەفی بە فیعلەوە دەلکێن تەنانەت کە دەنووسرێ «نەدەڕۆیشت» دەبێ وا لە قەڵەم بدرێ کە بەیەکەوە نووساون هەرچەند «نە، دە» بە حوکمی ئەلفوبێ ڕێی ئەوەیان نییە بە دوا خۆیانەوە بلکێن، لەبەر ئەمە لە نزیک یەکدییەوە دەنووسرێن.

ب- ئەم نیشانانە لە دوا پێشگریشدا هەر بە وشەوە دەلکێن وەک هەڵبگرە، هەڵمەگرە، هەڵنەگرێ، هەڵناگرێ، هەڵنەفڕێ، هەڵدەگرێ.

ج- کە ڕاناوی لکاو کەوتە نێوانەوە بە خۆی و ئەوەی پێش خۆیەوە لە وشەی دواوە دادەبڕێت وەک هەڵمدەگرت، هەڵمگرت، تێمگەییشت، بۆمهات، وەرمگرە... بەڵام لە نزیکیەوە دەنووسرێت.

د- کە ڕاناوی لکاو کەوتە دوای وشەی سەربەخۆوە لە هەموو بارێکدا لە وشەی دواوەی دوور دەخاتەوە وەک خانووم کرد، سەریان تاشی، دارەکەتان بڕیەوە...».

هـ- پێشگری پریپۆزیشن وەک «بێدین، بەناموس» بە وشەوە دەلکێت، بەڵام کە لە پێشگریەتی کەوت، لە وشەکە دوور دەکەوێتەوە وەک «دنیا بێ دین هەڵناکا، خانووم بە قوڕ و خشت کرد...».

ز- پێشگری لێکدراو هەمیشە بە جودا و دوور لە فیعلەوە دەنووسرێت وەک «تێک هەڵقژان، لێکەوە هاتن، پێکەوە ژیان».

6- هەموو پاشگرێک بە وشەی پێشیەوە دەلکێت، تەنانەت ئەگەر دوو پاشگر و دوو ڕاناوی لکاویش بە دوا یەکدیدا هاتن هەموویان پێکڕا بە وشەی پێشیانەوە دەلکێن وەک «مێوانداریتانم تاقی کردەوە، جووڵاندنەوەیانت ڕا لێ نەبوو».

7- داتاشین بەر واتاو حوکمی وشەی دارێژراو دەکەوێ هەرچەند ڕوونیش نییە ئەم داتاشینەی بانگەوازەکە چی مەبەستە. بە هەمەحاڵ ئەوەی بۆتە وشەی فەرهەنگی وەیا لە داتاشینەکەدا سوان و قرتان و سووک کردن پەیدا بووبوو بە سەریەکەوە وەیا لە شکڵی لکاودا دەنووسرێ.

8- قرتانی دەنگ هەر لە پەراوێزی زمانی ئێستاکەی کوردی بە هەند هەڵدەگیرێ. لەو پەراوێزەدا ئەو دەنگەی کە لە لەهجەیەکدا قرتابوو بەڵام لە لەهجەی دیکەدا زیندوو بوو دەبێ زیندوەکە بچێتەوە بۆ نووسینی ئەدەبی.

9- ژمارەکان بەم شێوەیە دەنووسرێن: چوار، حەفت، یازدە، دوازدە، سێزدە، چواردە، پانزدە یاخود پازدە، شازدە، حەڤدە، هەژدە، نۆزدە، حەفتا – حەفصەد – حەفسەد. دووەم، سێیەم، نۆیەم، دەیەم، یازدەم، دوازدەم – یازدەمین – دوازدەمین، سێزدەم،... هتاد. حەفتایەم، هەشتایەم، نەوەدەم، صەدەم،... هتد. هەزارەم، دەهەزارەم، ملیۆنەم، ملیۆنەمین.

10- ڕاناوی لکاو هەمیشە بە وشەی پێش خۆیەوە دەلکێ و لە هی دوا خۆیەوەی دادەبڕێ و لێی دوور دەخاتەوە مەگەر نیشانەکانی «مضارع، نفی، نهی، أمر» بەیەکەوە دەنووسرێن. دیارە ڕاناوی لکاو بە ڕاناوی لکاوەوە دەلکێت وەک «قسەتم پێ خۆشە، قەڵەمەکەت چ لێ کرد، دیتمانن...».

11- هەرچی «حروف العطف» هەیە بە جودا دەنووسرێ بەڵام

- دوورەپارێزی بکرێ لە بەکارهێنانی «وە» کە ڕاگوێستێکی دەقاودەقە لە عەرەبییەوە.

- واوی عەتفی کوردی دوور لە وشەی پێشیەوە بنووسرێ.

- کە واوی عەتف بوو بە کەرتی وشە دەبێتە بەشێکی بنجیی وشەکە و بە پیتەکانی دیکەوە دەلکێ «کەلوپەل، شتومەک... هتد».

- لە وشەی وەک «ملوپل، دەشتودەشت، کەلوکەل» واوەکە جودا بێ بەڵام لە نزیک پیتەکانی دیکەوە بێ.

- وشەی «هەر» کە لەگەڵ «کوێ، کێ، کام...»دا بە یەکەوە هاتن لێیانەوە نزیک بنووسرێ وەک هەرکام، هەرکێ، هەرکوێ. بەڵام کە گوتت «لە نێو کۆمەڵە وشەکەدا هەر کام بۆ پرسە» دەبێ «هەر» دوور بخرێتەوە چونکە بووە بە وشەی عەتف.

- «نە»ی نەفی و عەتف لە دووری وشەوە دەنووسرێت وەک نە دێم نە دەڕۆم، نە تۆ نە ئەحمەد هیچتان نەهاتن. بەڵام لە «نەمێر»دا لە وشەکە نزیک دەبێتەوە.

لە کۆتایی ئەم کورتەیەدا دەڵێم کاتی خۆی ئەنجوومەنی کۆڕ وای پەسەند کرد کە سێ ژمارەی یەک پیت بە دوا یەکدیدا هاتن دووی پێشەوە لە نووسیندا بەیەکەوە بلکێن سێیەمەکەش لە نزیکیانەوە بە جودا بێت یاخود بە پێی داخوازی ڕێزمان دووی دواوە بە جودا لە نزیک کۆتایی وشەکەوە بنووسرێن وەک «لادێیی، مێیینە» کە دەڵێن «یێی کراوە» سێیەمینیان جودا دەبێ وەیا کە دەڵێن «ئێوە عاشقی فەننن» نوونی سێیەم جودا دەبێ. وا دەزانم پێشنیازێکی باش بێ بۆ ئیمکان بوونی خوێندنەوەی سێ پیتی یەکجۆری بە دوایەکدا.

